جەوهەر محەمەد ئاغا مێرگەسۆری

# پەڕاوەکانی بەندیخانەی خەلان

(یاداشتی رۆژانە)

رێناس عەلی پیرانی
پێشەکیی بۆ نوسیوەو ئامادەی کردووە بۆ چاپ





بڵاوکراوەکانی
ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی



EDK

جەوهەر محەمەد ئاغا مێرگەسۆری

# پەڕاوەکانی بەندیخانەی خەلان

( یاداشتی رۆژانە )

ڕێناس عەلی پیرانی
پێشەکیی بۆ نوسیوەو ئامادەی کردووە
بۆ چاپ

بڵاوکراوەکانی
ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی
ستۆکهۆڵم ٢٠١٧




## ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی

سالی دامەزراندن : ٢٠١٤

شوێنی دامەزراندن: ستۆکهۆلم (سوید)

دامەزراوەیەکی سەربەخۆیە ئەرکەکەی پاراستنی دیکۆمێنتەکانی بزوتنەوەی کوردایەتییە لە تەواوی پارچەکانی کوردستاندا

# پێشەکی

ئەم یاداشتانە لەساڵانی ١٩٧٤و ١٩٧٥ نوسراون. نوسەری یاداشتەکان ناوی جەوهەر محەمەد ئاغای مێرگەسۆرییە. لەعەشیرەتی شێروانییەکانە. لەساڵی ١٩٤٣ لەقەزای مێرگەسۆری سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایك بووە.

جەوهەر تا پۆلی پێنجەمی ئامادەیی خوێندووە. دەرفەتی نەبوە، لەبەر هەلومەرجی ئەو کاتەی شۆڕشی کورد، خوێندن تەواو بکات. بەڵام هەر کەسێك ئەم یاداشتانە بخوێنێتەوە، ئەو باوەڕەی لەلا جێگیر دەبێت کەجەوهەر چ لەڕوی زمانە پاراوەکەیەوەو چ لەڕوی رۆشنبیریی گشتییەوە، بە بەراورد لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیو بە بەراورد لەگەڵ ئاستی رۆشنبیریی ئەو سەردەمەدا، روناکبیرییەکی فراوانو هەمەلایەنەی هەبوە.

جەوهەر لەساڵی ١٩٦٣دا، لەتەمەنی ٢٠ ساڵیدا، لەگەڵ محەمەد ئاغا مێرگەسۆریی باوکیو لەگەڵ براکانی، فاخرو ئەسعەدو رەشیدو جەمیل و مەجیدو سەعیدو حسێنو لەگەڵ خەلیلی ئامۆزای، بۆتە پێشمەرگە. لەوساوە خۆیو بنەماڵەکەی رۆڵی زۆر کاریگەریان لەشۆڕشدا هەبوە. هەر ئەوەندە بەسە باسی شەڕی هەندرێن بکەین کە لەساڵی ١٩٦٥دا رویداوە. لەسەرچاوە مێژوویییەکاندا فاخر مێرگەسۆری، برای جەوهەر، بەپاڵەوانی شەڕی هەندرێن دادەندرێ. لەو شەڕەدا پێشمەرگە سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەسەر سوپای عیراقدا بەدەست هێناو سوپای عیراقی توشی تێکشکانێکی گەورە کرد، بەڕادەیەك کەباڵی مەدەنیی حکومەتی عیراق باڵادەستی پەیدا کردو باڵی عەسکەری کەپێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەتاکە چارەسەر بۆ مەسەلەی کورد چارەسەری عەسکەرییەو نابێ

حکومەت هیچ نەرمییەك بەرامبەر بەکورد بنوێنێ‌و نابێ کار بۆ چارەسەری مەسەلەکە بەشێوەیەکی ئاشتییانە بکات، ئەو باڵە بەهۆی شکستە گەورەکەی لەشەڕی هەندرێن، دەمکوت کراو توشی شەرمەزارییەکی زۆر هات. دوای ئەم شەڕە، باڵی مەدەنی بەسەرۆکایەتیی سەرەك وەزیران دکتۆر عەبدولرەحمان بەزاز دەستی بەوتوویژ کرد لەگەڵ شۆڕشی کورد و ئامادەیی دەربڕی کە لەڕێگەی سیستمی لامەرکەزییەوە مەسەلەی کورد چارەسەر بکات. بەزاز پاش وتوویژ لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد، لە٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ بەیاننامەی دەرکردو رایگەیاند کەحکومەتەکەی لەسەر بنەمای سیستمی لامەرکەزیی ئیداری، کەسیستمێکی نزیك لەئۆتۆنۆمییە، مەسەلەی کورد چارەسەر دەکات‌و لەبواری فێرکاری‌و شارەوانی‌و تەندروستیدا دەسەڵاتی تەواو دەدات بەپارێزگاکان. سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد رەزامەندیی لەسەر ئەم رێوشوێنەی چارەسەر نیشاندا. بۆیە، لەڕاستی دور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین فاخر مێرگەسۆری پاڵەوانی راستەقینەی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانە چونکە ئەم بەیاننامەیە زادەی ئەو شکستە کەمەرشکێنەیە کەسوپای عیراق لەساڵی ١٩٦٥ لەشەڕی هەندرێن دوچاری بووە. پاش شەڕی هەندرێن فاخرو براکانی ناوبانگێکی زۆریان پەیدا کرد چونکە سەرکەوتنەکەی شەڕی هەندرێن لەسەر دەستی ئەوان هاتۆتە دی. ئەوی راستیش بێ، سەرەتای دڕدۆنگی‌و کێشەی نێوان بنەماڵەی بارزانی‌و بنەماڵەی مێرگەسۆری بۆ ئەم شەڕە دەگەڕێتەوە چونکە بنەماڵەی بارزانی حەزی نەدەکرد هیچ کەس‌و بنەماڵەیەك لەشۆڕشدا ناوبانگ پەیدا بکاو لەناو خەڵکدا خۆشەویست بێ‌و ئەمەی بەمەترسی بۆ سەر پێگەی خۆی دەزانی.

لەوانەیە هۆی دیکەش هەبێ. بنەماڵەی مێرگەسۆری بەپێچەوانەی بنەماڵەی بارزانییەوە بنەماڵەیەکی رۆشنبیر بوو، بیروباوەڕی مەدەنی‌و

پێشکەوتنخوازانە لەناویاندا پەرەی سەندبوو. هەندێ لەکوڕانی محەمەد ئاغای مێرگەسۆری ئەندامی حزبی شیوعیی عیراق بوون، بۆیە دیدی سیاسییان پێشکەوتوتر بوو و نۆڕینی کۆمەلایەتیشیان کراوەترو مەدەنیتر بوو. تەنانەت لەشەڕەکەی هەندرێنیش رێکخستنە نهێنییەکانی حزبی شیوعی لەناو هێزەکانی سوپای عیراق لەهەندرێن، رۆلێکی گرنگیان لەدروست کردنی سەرکەوتنەکەدا هەبوو، ئەویش بەپێدانی زانیاریی گرنگ لەسەر هێزەکانی عیراق و شێوەی بلاوبونەوەیان و دیاری کردنی شوێنە لاوازەکانی گردبونەوەیان.

ئیتر لێرە بەدواوە پلان بۆ تەنگهەلچنین بەم بنەمالەیە دانرا بەمەبەستی کەم کردنەوەی رۆلی لەخەباتی نەتەوەییدا، تا کار گەیشتە رادەی دەست کردن بەکوشتنیان. لە١٤ی شوباتی ١٩٧١دا جەمیل محەمەد ئاغا مێرگەسۆری لەهەولێر تیرۆر کرا. مێرگەسورییەکان گومانیان هەبوو کوشتنەکە دەستی مەسعودو ئیدریس بارزانیی تێدایە بەلام هیچ بەلگەیان بەدەستەوە نەبوو. مەسعودو ئیدریس بۆ شاردنەوەی رۆلیان لەتاوانەکەدا، بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی چوون بۆ پرسەی جەمیل و سەرەخۆشیشیان لەباوك و براکانی کرد.

ئەیوب بارزانی کە کوڕی شێخ بابۆیەو ئامۆزای مەسعودو ئیدریس بارزانییە، ئەوەی لەبنەمالەی مێرگەسۆری بیستبوو کە کوشتنەکە دەستی کوڕەکانی مەلا مستەفای تێدایە. بۆیە لەگوندی رێزان چاوی بەمەسعود بارزانی کەوتبوو، ئەم پرسەی لەگەلدا وروژاندبوو. مەسعود بارزانی نکولیی لەوە کردبوو دەستی لەکوشتنی جەمیل هەبێ و ئەوەی بە بەلگە هێنابۆوە کە ئەگەر ئەوان لەپشت کوشتنی جەمیلەوە بن، بۆچی دەچن بۆ پرسەکەی و سەرەخۆشی لەباوکی و لەبراکانی دەکەن. ئەیوب بارزانی لەکتێبەکەیدا دەربارەی شۆڕشی ئەیلول نوسیویەتی "من بەتەواوی باوەڕم

پێ کرد بەڵام زۆری نەبرد ڕووداوەکان پێچەوانەی ئەمەیان ساغ کردەوە"[1].

شێروانییەکان وازیان لەمەسەلەکە نەهێنا. چوونە بنج و بناوانی و ئاخرەکەی بۆیان دەرکەوت کوشتنەکە دەزگای پاراستنی لەپشتەوەیە. ئەو دەزگایەش بەرپرسەکەی مەسعود بارزانی بوو. دیسان چوو بوونە بنج و بناوانی مەسەلەکە، بکوژەکەشیان دۆزی بوەوە، گرتبوویان، دانی بەوەدا نابوو کەفەرمانی کوشتنی جەمیلی پێ دراوە، ئیتر بەسزای ڕەوای خۆی گەیەنرابوو. پیاوکوژەکەی دەزگای پاراستن تورکمانێکی خەڵکی هەولێر بوو، ناوی محەمەد ڕەئوف بوو. پاش ئەم ڕووداوەو پاش ئاشکرابونی ئەوەی کەدەزگای پاراستن لەپشت کوشتنی جەمیلەوەیە، محەمەد ئاغا مێرگەسۆری و کوڕەکانی، فاخرو سەعیدو ئەسعەدو مەجیدو ڕەشیدو خەلیلی ئامۆزایان، هەمویان بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی دەستگیر کران و خرانە زیندانی ڕاپاتەوە. دواتر، نوسەری ئەم یاداشتە، جەوهەر، ئەویش دەستگیر کرا، وەك دەستبەسەر لەبەندیخانەی خەلان مامەڵەی لەگەڵدا کراو تەنها پێش هەرس هێنانی شۆڕش بەماوەیەکی کەم خرایە بەندیخانەی راپاتەوەو وەك گیراوەکانی تر مامەڵەی لەگەڵدا کرا. زۆربەی ئەم یاداشتە لەکاتی دەستبەسەرییەکەی جەوهەردا نوسراوە کەتێیدا تارادەیەك ئازاد بووە لەهاتوچۆ، ئەویش بەئاگاداریی لێپرسراوەکان و بەو مەرجەی کە بەبێ پاسەوان نەچێ بۆ هیچ شوێنێك. واتە لەژێر چاودێریی بەردەوام دا بووەو سنوری پەیوەندیو هاتوچۆی بۆ دیاری کرابوو.

لەڕاستیدا هەرچەند گرتنی بنەماڵەی مێرگەسۆری پەیوەندیی بەڕووداوی تیرۆرکردنی جەمیلەوە هەیەو لەوردەکارییەکاندا پەیوەندیی بەکوشتنی نۆکەرێکی پیاوکوژی دەزگای پاراستنیشەوە هەیە، بەڵام

---

[1] ایوب بارزانی، الحركة التحررية الكردية وصراع القوى الاقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، دار نشر حقائق المشرق، جنيف، ٢٠١١، ص ٣٨٦.

مەسەلەکە دوو هۆی دیکەشی هەیە.

مەلا مستەفا بارزانی دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لێبوردنی بۆ جاشەکان دەرکردبوو. شێروانییەکانو بارزانییەکان دژی لێبوردنەکە نەبون بەلاّم دژی ئەوە بون پلەو پایە بەجاشەکان بدرێ، بەتایبەتی جاشە زێبارییەکان. مەلا مستەفا لەنێو جاشەکاندا دەسەلاّتێکی زۆری بە زوبێر ئاغای زێباری دابوو تا ئەو رادەیەی کەزێبارییەکان کەوتبوتە تەنگەتاوکردنی بارزانییەکان. زوبێر خالّی مەسعود بارزانی بوو. مەلا مستەفا پلەیەکی گەورەی پێ دابوو کەهەموو پێشمەرگە دێرینە بارزانییەکان پێیان ناخۆش بوو. هەلّوێستی بارزانییەکانو شێروانییەکان بەرامبەر بە زوبێر ئاغاو کۆنە جاشە زێبارییەکان ئەوەندەی تر دڕدۆنگیی لەنێوان مەلا مستەفاو بنەماڵەی محەمەد ئاغای مێرگەسۆری دروست کردبوو[1].

هەروەها لەو کاتەدا مەلا مستەفا پەیوەندیی گرژی لەگەلّ کوڕی گەورەی خۆی عوبەیدوللاّو عوسمان بارزانیی کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانیدا هەبوو. مەلا مستەفا نیگەران بوو لەوەی بنەماڵەی مێرگەسۆری لەگەلّ عوبەیدوللاّی کوڕی و هەروا لەگەلّ شێخ عوسمان یەك بگرنەوەو دژایەتیی بنەماڵەی بارزانی بکەن، بۆیە مەلا مستەفا چاودێریی هەموانی دەکردو لەکۆتاییدا مەسەلەکە بەوە گەیشت کەمەلا مستەفا عوبەیدوللاّی خستە زیندانەوەو هێزی بردە سەر بارزان بۆ هەڕەشەکردن لەشێخ عوسمانو هەروەها محەمەد ئاغا مێرگەسۆریو کوڕەکانی گرت. لەم چوارچێوەیەدا کێشەکە بۆ خوێنەر روون دەبێتەوەو زانیاریی پێویستی دەربارەی پێشینەی کێشەکە دەست دەکەوێت.

جەوهەر، بەبێ گوێدانە کێشەی بنەماڵەکەی لەگەلّ بنەماڵەی بارزانی،

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ٣٦٨- ٣٦٩.

مەلا مستەفا بارزانیی زۆر خۆش دەویست. کاتێك لەیاداشتەکاندا ناوی دێنێ، زۆر بەڕێزەوە باسی دەکاو هیچ گومانێکی لەنیشتمانپەروەریی مەلا مستەفا نەبوە. بەڵام پێی وابوو شۆڕش بەم شێوەیە بەڕێوە ناچێ‌و ئەو شێوازەی کەشۆڕشی پێ ئیدارە دەدرێت مەترسیی زۆر شتی گەورەی لێ دەکرێ. یاداشتەکان نیشانی دەدەن کە گەندەڵییەکی زۆر لەناو شۆڕشدا پەیدا ببوو، هەروەها دیوارێکی بەرز لەنێوان سەرکردایەتی‌و هاوولاتییەکاندا دروست ببوو، لەولاشەوە هەموو نەخشەو پلانی سەرکردایەتیی شۆڕش لەسەر ئەوە دامەزرا بوو کەپەرە بە پەیوەندییەکان لەگەڵ رژێمی شا بدرێ‌و هیچ حیسابێك بۆ ئەگەری رێککەوتنی رژێمی شای ئێران‌و رژێمی حزبی بەعس نەکرابوو.

جەوهەر خۆی بەپارتییەکی رەسەن دادەنا. یاداشتەکان لەیەکەم دێڕەوە تا دوایین دێر ئەمە دەسەلمێنن. لەو پەرەگرافانەی کە لەیادی ٢٨ ساڵەی دامەزراندنی پارتیدا نوسیویەتی، وەك پارتییەکی دڵسۆز دەردەکەوێت. لەو نامەیەش کە بەزمانی عەرەبی بەم بۆنەیەوە بۆ مەلا مستەفا بارزانیی نوسیوە، هەست ناکرێ دەستگیرکردنی باوك‌و براکانی‌و دەستبەسەرکردنی خۆی، تۆزقاڵێك کاری کردبێتە سەر دڵسۆزیی بۆ پارتی‌و باوەڕی بەمەلا مستەفا. لەوانەیە مەسەلەکەی وەها لێك دابێتەوە کەکێشەکە کێشەی ناو یەك ماڵەو لەکۆتاییدا هەر بەئاشتبونەوەو پێکهاتن دوایی دێت. جەوهەر هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە دەشێ رق‌و کینە بگاتە ئەو رادەیەی بڕیاری جینۆسایدکردنی بنەماڵەکەی بدرێ، بەتایبەتی کەکێشەی بنەماڵەکەی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی کێشەیەکی وا گەورە نەبووە کە بەکوشتن‌و بڕین چارەسەر بکرێت.

بەگوێرەی ئەو دەفتەرە بچوکەی لەگیرفانی کراسی جەوهەر پاش شەهیدکردنی دۆزرایەوە، جەوهەر لەرۆژانی کۆتایی تەمەنیدا گەیشتبوە ئەو بڕوایەی کەخۆی‌و بنەماڵەکەی لەسەدا سەد دەکوژرێن. بەهەر حاڵ،

تاوانە گەورەکە روویداو کارەساتێکی مرۆڤانەی لێ کەوتەوەو بنەماڵەیەکی بێتاوان بەشێوەیەکی دڕندانە جینۆساید کرا.

لەم یاداشتانەدا جەوهەر وەك کەسێکی رۆشنبیر دەردەکەوێ کە لێکدانەوەی بۆ روداوەکان هەیەو زۆر بەجوانیش بەدوایاندا چووە. لەو روداوانەی کەزۆر بایەخی پێ داوە، هێرشی تورکیایە بۆ سەر قوبرس لەساڵی ١٩٧٤. هەروەها زۆر بایەخی بەروداوێکی جیهانیی وەك شەرمەزارییەکەی وتەرگێتو دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆکی ئەمریکا ریچارد نیکسۆن داوە.

ئەو یاداشتانەی لێرە بلاو دەکرێنەوە، تەواوی یاداشتەکان نیە بەڵکو تەنها ئەو دەفتەرانەیە کەپارێزراونو لەفەوتان رزگار کراون. بەشی یەکەمی یاداشتەکان شێوەی وتاری وەرگرتووەو زۆرتر بۆ هەلومەرجی دەستپێکردنەوەی شەڕ لەساڵی ١٩٧٤ تەرخان کراوەو هەر لەم بەشەشدا دەچێتە سەر هەندێ باسی گرنگ لەوانە تێڕوانینی بۆ پەرەسەندنی دیاردەی گەندەڵیو ناعەدالەتی لەناو ریزی شۆڕشدا بەشێوەیەکی ترسناك بەجۆرێك کەکاری کردۆتە سەر رادەی ئامادەبونی پێشمەرگە بۆ فیداکاریو خۆبەخت کردن. بۆچونی جەوهەر لەسەر ئەم مەسەلەیە کە لەبەشی یەکەمو سێهەم دەری بڕیوە، ئەوەیە کەپێشمەرگە تا خۆی بە مەغدورو پەراوێزخراو بزانێ، ئامادەیی قوربانیدانو حەماسەتی بۆ شەڕ کەم دەبێتەوە، چونکە نایەوێ لەپێناوی ئەو لێپرسراوانە خۆی بەکوشت بدات کەهەموو هەوڵو بیرکردنەوەیان تەنها بۆ خۆدەوڵەمەندکردنو ژیانی خۆش تەرخان کردووە.

لەبەشی دووەمی یاداشتەکان بەولاوە، بیرەوەرییەکان بەشێوەیەکی رۆژانە نوسراون. بەشی دووەم لەبیرەوەرییەکان رۆژی ٧/ ٢ /١٩٧٤ دەست پێ دەکەنو لە ٢٦/ ١٠ /١٩٧٤ کۆتاییان دێ. بەشی سێیەم بەهەمان شێوە نوسراونو لە ١٩٧٥/٣/٤ دەست پێ دەکەنو لە ١٩٧٥/٣/١٩

کۆتاییان دێ. ئەم بەشە زۆرتر بۆ بارودۆخی دژواری قۆناغی واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیری نێوان شای ئێرانو سەددام حسێن تەرخان کراوەو تێیدا وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵكو نیگەرانییان لەهەرەسی شۆڕشو چەك فڕێدانو ئاوارەیی لەئێران یان خۆبەدەستەوەدان و گەڕانەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی بەعس زۆر بەجوانی تۆمار کراوە.

یاداشتەکان پەڕاوی چوار مانگیان ونە چونکە ئەو پەڕاوو دەفتەرانەی کەباس لەو ماوەیە دەکەن چنگمان نەکەوتونو لەبارودۆخی شێواوو دژواری ئەوێ ڕۆژێ فەوتاون. بۆیە ئێمەش هەر ئەوەندەمان لەیاداشتەکان بڵاو کردۆتەوە کەچنگمان کەوتووەو ئومێدەوارین هەر کەسێك باقی پەڕاوو دەفتەرەکانی ئەم یاداشتانەی لەلایە، یان دەزانێ لەکوێ دەست دەکەون، فریامان بخا تاکو لەچاپی دووەمدا هەر هەمووی پێکەوە چاپ بکەینەوە.

ناسۆرترین بەشی مەینەتیی بنەماڵەی مێرگەسۆرێ ئەو بەشەیە کەتێیدا بنەماڵەکە بەباوكو براکانەوە جینۆساید دەکرێن. لەوەش ناسۆرترو ناخۆشتر ئەوەیە کەئەم بنەماڵەیە لەو کاتەدا جینۆساید کراوە کەشۆڕش لەهەرەس هێناندا بووەو بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی شۆڕشو وازهێنان لەخەبات دراوە. لەکاتێکدا سەرکردایەتیی شۆڕش بڕیاریدا بوو واز لەشۆڕش بێنێو بچێ بۆ ئێرانو لەوێ مافی پەنابەرێتیی سیاسی وەرگرێ، لەو کاتەدا ئەو سەرکردایەتییە بڕیاری لەناوبردنی بنەماڵەی مێرگەسۆریی داوە. تائێستا نەزانراوە کێ بڕیارەکەی دەرکردووە. ئایا بڕیارەکە دەستی مەلا مستەفا بارزانیی تێدایە یان مەسعود بارزانی یان ئیدریس بارزانی؟ یان دەستی هەرسێکیانی تێدایە؟ کەس لەخۆیەوە ئەمەی نەکردوە بەڵکو بڕیاری لەناوبردنی بنەماڵەی مێرگەسۆری بەشێوەیەکی مەنهەجیو لەسەر ئاستێکی بەرز دراوە. بەپێی زانیارییەکان، دوو کەس بەناوی عەبدولوهەیمن بارزانیو ئازاد بەرواری لەبارەگای بارزانییەوە چوون بۆ بەندیخانەی رایات، لیستێکیان پێ بووە، ناوی هەموو

گیراوەکانی بنەماڵەی مێرگەسۆریی تێدا بووە، ناوەکانیان یەك لەدوای یەك خوێندۆتەوەو پێیان راگەیاندون کەئازاد دەکرێن. پاش ئەوەی کەبراونەتە دەرێ، گیراوەکان دیار نەماون و پاشان تەرمەکانیان لەگۆڕێکی بەکۆمەڵ بەکەلەپچەکراوی دۆزراونەتەوە.

جەوهەر ئەم بیرەوەرییانەی بۆ بڵاوکردنەوە نەنوسیوەو هەرگیز بەبیریدا نەهاتووە رۆژێ لەڕۆژان بڵاویان بکاتەوە. لەوانەیە ئەگەر خۆی و باوکی و براکانی لەدەستپێشخەرییەکی جوامێرانەدا ئازاد بکرانایە، هەمووی بسوتاندایە. بەڵام کەوا مەسەلەکە وا دەرنەچووە، بیرەوەرییەکانی بونەتە دیکۆمێنتێکی گرنگ و دەچنە ریزی ئەدەبیاتی هونەری نوسینی یاداشتەکان.

بێگومان پەڕاوو دەستنوسەکانی ئەم یاداشتانە هیچ ناونیشانێکیان بۆ دانەنراوە. ئەو ناونیشانەی لەسەر بەرگی ئەم کتێبە دانراوە، ناونیشانێکی داهێنراوەو هەوڵ دراوە ناوەڕۆکی بیرەوەرییەکانی تێدا رەنگ بداتەوە.

ئەو پەراوێزانەی لەخوار لاپەڕەکاندا هەن، هیچیان لە ئەسڵی بیرەوەرییەکاندا نیە بەڵکو وەك لە بڵاوکردنەوەی دەستنوس و دیکۆمێنتەکاندا باوە، ئامادەکار یان پشکنەری دیکۆمێنتەکان ئەرکی رێکخستنی پەراوێزەکان دەگرێتە ئەستۆ، ئەویش بۆ رونکردنەوەی هەر بابەتێك کە پێویستی بە ڕونکردنەوە بێت.

جێی خۆیەتی ئەم پێشەکییە بەگوتەیەکی ناو یاداشتەکان کۆتایی پێ بهێنین. جەوهەر نوسیویەتی "شۆڕشمان لەناو چوو بەڵام هەستی نەتەوایەتی و ئاگری ناو دەرونی کوردایەتی هەرگیز نامرێ و ناکوژێتەوە". قسەیەکی جوانە. هەستی نەتەوایەتی و ئاگری ناو دەرونی کوردایەتی هەرگیز دانامرکێتەوە. وتەکە راستەو روداوەکان بەکردەوە سەلماندویانە.

رێناس عەلی پیرانی

ئۆپسالا- سوید

# جەوهەر محەمەد ئاغا مێرگەسۆری بناسە

جەوهەر کوڕی محەمەد ئاغای مێرگەسۆری کوڕی ساڵح کوڕی محەمەد ئاغا کوڕی حەسەن بەگ کەکلەیی کوڕی میر مەلایە، ناسراو بە جەوهەر مێرگەسۆری.

ساڵی ١٩٤٣ لەقەزای مێرگەسۆر لەدایك بووە. شەهید جەوهەر دوو جار ژیانی هاوسەرگیریی پێك هێناوە. لەساڵی ١٩٦٧ هاوسەرگیریی یەکەمی لەگەڵ خاتوو جەواهیر پێك هێناوەو دوو کچو کوڕێکی بەناوی "پەیمان"و "پەرێز"و "کاروخ" لێ بووە. هاوسەرگیریی دووەمی لە٤ی شوباتی ١٩٧٤ لەگەڵ سورەیا کەریم خەڵکی کەلار کردوە لەناوچەی حاجی ئۆمەران لەگوندی خەلان لەم هاوسەرگیرییەش کوڕو کچێکی بەناوی "ئەندێرا"و "غاندی" هەبووە.

شەهید جەوهەر تا پۆلی پێنجەمی ئامادەیی خوێندوە چونکە دۆخی ئەو کاتی شۆڕش‌و کورد رێگر بوو لەتەواو کردنی خوێندنی.

ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ شەهید محەمەد ئاغای باوکی و شەهید فاخری برای‌و شەهید ئەسعەدی برای و شەهید رەشیدی برای و شەهید جەمیلی برای و شەهید مەجیدی برای و شەهید سەعیدی برای و شەهید خەلیلی ئامۆزای‌و شەهید حسێنی برای و شەهید نزاری برای چەکی شەرەف و پێشمەرگایەتیی کردە شانی‌و ژیانی خەبات و تێکۆشانی بۆ گەلەکەی کردە پیشەو ئارەزوی ژیانی.

شەهید جەوهەر نوسەرێکی زۆر بەتواناو گەنجێکی روناکبیرو خاوەنی هزرو بیرێکی بەتوانای سیاسی و سەربازی بوە، لەهەمان کاتیش دەستێکی باڵای هەبووە لەوێنەکێشان. یەکێك لەو وێنانەی کە لەساڵی ١٩٧٣ دەستی پێ کردبوو و لەساڵی ١٩٧٤ زۆربـــــەی تـــەواو کردو وێنەکەشی

بەناوی (بوکابێری) بووە کە لەیاداشتە دەستنوسەکانی خۆی نوسیویەتی و دەڵێ:

"ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ من خەریکی رەسم کردنی تابلۆ زلەکەی بووکا بێری بوم کە لەمانگی رەمەزانی ١٩٧٣ دەستم پێ کردبوو... ئەم بەهارەی ١٩٧٤ توانیم زۆربەی تابلۆکە تەواو بکەم".

لەهەمان کاتدا تەکنیککارێکی بلیمەت بوو لە دروست کردنی فرۆکەی بێ فڕۆکەوانو ئۆتۆمبێلی جۆراو جۆرو، هەروەها زانیاریی تەواویشی لەسەر بواری پزیشکی هەبوو. رۆژێك غاندیی کوڕی توشی ئازارێکی زۆری سك بووە، جەوهەریش داوای لەباوکی خۆی دەکات کەرێگەی پێ بدات بۆ ئەوەی نەشتەرگەری بۆ کوڕەکەی بکاو چارەسەری بکا بەڵام دواجار باوکی داواکەی رەت کردۆتەوە، پێ وتووە جەوهەر ئەمە وێنە نیە دروستی بکەی، فڕۆکەش نیە بیفڕێنی. دوا جار بردویەتی بۆ لای برین پێچێك.

لەبەر شارەزاییو ئەزمونی هەمەلایەنەی، سەرکردایەتیی ئەوسای شۆڕشی ئەیلول بۆ سەرجەم کارەکانی شۆڕشی ئەیلول پرسو رایان بەشەهید جەوهەر کردوە لەڕوی سیاسیو دبلۆماسی و سەربازی و کۆمەڵایەتی و هتد.

### بەرهەم و دەستنوسەکانی تری شەهید جەوهەر

١-چیرۆکی (نانەوا) وون بووەو کەوتۆتە دەست کەسێکی نەناسراو.

٢-نامیلکەیەکی گیرفان بەناوی (دیسان بەندیخانە) لەکاتی هێنانەوەی روفاتەکانیان بۆ هەولێر، لەوێشەوە بۆ مێرگەسۆر لەناو گیرفانی شەهید جەوهەر بووە. لای کەسوکاری خۆی پارێزراوە ٢٠ لاپەڕەیە. ئەم نامیلکەیە بەپێنوسێکی رەنگی سور نوسیویەتی. هەڵبژاردنی رەنگی سوریش هێمایە

بۆ دوا ساتی ژیانی و خوێن رشتنی و شەهیدبوونی.

٣-دەستنوسێکی تری ٢٠ لاپەڕەیی لەسەردەمی دەستبەسەری لەزیندان نوسیویەتی بەناونیشانی (بین السائل والمجیب) لەرادیۆی BBC وەری گرتووە.

٤-دەفتەری (کەشکۆڵ) ٣٠ لاپەڕەیە تەنها ٢٠ لاپەڕەی ماوە.

٥-یادداشتە ١٦٨ لاپەڕەییەکەی کەدەستنوسی خۆیەتی.

شەوی ٢٣/٢٢ی ئازاری ١٩٧٥ خۆی و باوکی و برایەکانی بەفەرمانی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول گوللەباران کران. ئەمەش لیستی شەهیدەکانی بنەماڵەی مێرگەسۆرییە:

١-شەهید محەمەد ئاغا ساڵح محەمەد ئاغا (١٩٠٢) لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٢-شەهید ئەسعەد محەمەد ئاغا (١٩٣٧) لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٣-شەهید رەشید محەمەد ئاغا(١٩٣٤) لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٤-شەهید فاخر محەمەد ئاغا (١٩٣٧) لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٥-شەهید سەعید محەمەد ئاغا ١٩٤٥ لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٦-شەهید جەوهەر محەمەد ئاغا ١٩٤٣ لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

٧-شەهید جەمیل محەمەد ئاغا (١٩٤٧) لە١٤/٢/١٩٧١ لەهەولێر بەدەستی دەزگای پاراستن شەهید کرا.

٨-شەهید مەجید محەمەد ئاغا (١٩٤٦) لەزیندانی رایات لەحاجی

ئۆمەران شەهید کرا.

٩-شەهید خەلیل سولتان برازای محەمەد ئاغا (١٩٤١) لەزیندانی رایات لەحاجی ئۆمەران شەهید کرا.

١٠-شەهید حسێن محەمەد ئاغا (١٩٣٢) لەساڵی ١٩٦٣ بۆ داکۆکی لەخاکی بارزان لەبارزان (ملێ سارێچێ) شەهید بووە

١١-شەهید نزار محەمەد ئاغا (١٩٥٥) لەبەغدا شەهید کرا لەهۆتێل ئاسۆ لەشارع رەشید. گوایە خۆی کوشتوە.

هەروەها خەلیل برادۆستی، ناسراو بە خەلۆ قارەمان، لەگەڵ محەمەد ئاغاو کورەکانی شەهید کراوە، ئەویش تا ئێستا لەگەڵ فاخرو سەعید شوێنبزرە.

# محەمەد ئاغا مێرگەسۆری و رۆڵی لەکۆماری مەهاباد

زۆرتر بەناوی حەمەد ئاغا بانگ کراوە. لەساڵی ۱۹۰۲ لەدایك بووە. چوار ژنی هێناوەو ۳ کچ و ۱۰ کوڕی هەبوە.

رابردوویەکی نیشتمانپەروەرانەی هەیەو هەمیشە لەریزی گەل دا بووە لەدژی داگیرکەران. رۆڵی کاریگەری لەشۆڕشەکانی بارزان هەبووە. ساڵی ۱۹۳۰ لەگوندی ئەلوش برینداربووە. ساڵی ۱۹۳۲ سەرپەرشتیاری ئەو هێزانە بووە کە بەرگرییان لەبارزان کردووە. ساڵی ۱۹٤۰ حکومەتی عیراق لەسۆنگەی جموجوڵ و چالاکییەکانییەوە ۳ ساڵ زیندانیی بەسەردا سەپاندووە.

لەساڵی ۱۹٤٥دا لەکاتی شۆڕشی بارزاندا پردی خەلانی تەقاندەوە بۆ ئەوەی رێ لەپێشڕەویی هێزێکی سوپای عیراق بگرێت. لەساڵی ۱۹٤٦دا لەکۆماری مەهاباد پلەی کۆلۆنێلی پێ بەخشراوەو کراوەتە لێپرسراوی بەرەی سەقز. دوای روخانی کۆماری مەهاباد، لەگەڵ بارزانییەکان گەڕایەوە بۆ عیراق و ماوەیەکی کەم لەدیانا مایەوە. دواتر خۆی و شێخ ئەحمەد بارزانی و وەهاب ئاغای رەواندزی لەلایەن حکومەتی عیراقەوە گیران و هەرسێکیان درانە دادگاو حوکم دران. محەمەد ئاغا مێرگەسۆری بەشەش ساڵ زیندانی حوکم درا. لەساڵی ۱۹٥۳ حوکمەکەی تەواو کرد، ئازاد کراو گەڕایەوە بارزان.

زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی لەبیرەوەرییەکانیدا باسی محەمەد ئاغا مێرگەسۆری دەکات و لەبەشی سێیەمدا لەژێر سەردێری "تێکچونی کۆماری کوردستان" نوسیویە:



محەمەد ئاغا مێرگەسۆری
لەسەردەمی پێشمەرگایەتیدا

"کاتێك زانرا کوردستانیش شەڕ ناکات، ئاڵۆزی پەیدا بوو. ئەو ماڵە بارزانییانەی لەمەهاباد و دەوروبەریشی بوون، باریان کردو ڕۆیشتنە شنۆو گوندەکانی دەوروبەری نەغەدەو شنۆو زەرزا. لەگەڵ گرتنی تەوریز، سەربازەکانی ئازەربایجان ئەوانەی لەکوردستان لەگەڵ لەشکری کورد لەبەرەی ناوچەی سەقز بوون، گەڕانەوەو خۆیان دایە دەستی سوپای شای ئێران. لەدوای ڕۆیشتنی ئازەربایجانییەکان، لەشکری بارزانییەکانیش ناچار بوو بەرەو میاندواو بگەڕێنەوەو لەگەڕانەوەیاندا لەڕێگا نۆکەرانی شاپەرست ویستبویان ڕێگایان لێ بگرن و چەکیان بکەن. پیاوانە هاتبونە دەستو بەرەنگاریان بوون، خۆشیان نەیانزانی بۆ کام لا رابکەن. ئەوان وایان دەزانی وەك سەربازەکانی ئازەربایجانی پێشمەرگەکانی کوردیش چەك دەکەن کەچی توشی هەلاکەتێك بوون مەگەر تەنها خۆیان بزانن چییان بەسەر هات. ئەو لەشکرەی بارزانییەکان کە لەسەقز گەڕایەوە، بەسەرپەرشتیی حەمەد ئاغای مێرگسۆری و سلێمان بەگی دەرگەڵەیی بەرەو سابڵاغ دەهاتن کەتۆپەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو لەوێوە تا نەغەدە بەراکێشان بەهۆی گاو گامێش. بەهیلاکی و ماندوبونێکی زۆرەوە ئەو تۆپانەیان گەیاندبوە نەغەدە. لەوێشەوە بۆ شنۆ... شەو داهات لەخوار گوندی قونقەڵا ماشێنەکەمان لەکار کەوت. لەوێ بەپێیان کەوتینە ڕێ. کاتێك گەیشتینە ئەوێ، سەرەتای لەشکر دەهاتنەوە. گوتیان حەمەد ئاغا نزیکە وا دێت لەدوای ئێمەیە. لەدوای کەمێك بەیەك گەیشتین. حەمەد ئاغا گوتی: "بگەڕێوە، باوکت وا لەدواوەیە، لەگەڵ تۆپەکان دێت". منی لەگەڵ خۆی گێڕایەوە. ڕۆیشتینە سابڵاخ. کاتێك گەیشتینە ناو شار، شەو درەنگ بوو... ئێمە ڕۆشتینە ماڵی پێشەوا (قازی محەمەد). پێشەوا هەر وەك جاران پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین و یەکە یەکە تەوقەی لەگەڵ کردین. چەند جارێك گوتی "یاخوا بەخێر بێن". لەحەمەد ئاغای پرسی " خۆ

بسەلامەتی گەڕانەوە؟" حەمەد ئاغا مێرگسۆری لەوەلامدا گوتی "بەڵێ، گەورەم. بسەلامەتی گەڕاینەوە. لەڕێگا هەندێ کەسانی شاپەرست ویستیان ڕێگامان لێ بگرن، بەڵام زوو بڵاوەیان پێ کرا". حەمەد ئاغا زیاتر دواو گوتی "جەنابی پێشەوا من بۆ ئەوە لام داوەتە لای ئێوە کەبفەرموون لەگەڵ ئێمە بێن بەرەو سنور بڕۆین. بزانین لەدواییدا سەرمان بەچی دەگات"

پێشەوا گوتی "زۆر سوپاسی هەستی پاکی ئێوە دەکەم. دەبێ نیگەران نەبن. من ناتوانم سابلاخ بەجێ بهێڵم، لەبەر ئەوەی بەڵێنم بەخەڵکی ئەو شارە داوە بەجێیان نەهێڵمو ناتوانم بەجێیان بێڵم".

حەمەد ئاغا (مێرگسۆری) زۆر هەوڵی دا بەڵکو ڕازی بکات، بەڵام هەر ڕازی نەبوو لەگەڵ ئێمە دەر بکەوێت. لەدواییدا بەحەمەد ئاغای گوت "ئەگەر لەسابلاخیش دەر بکەوم، ناتوانم لەگەڵ ئێوە دەر بکەوم. لەوانەیە بەخۆشت بزانی". لەدواتیدا حەمەد ئاغا زیاتر لەسەری ڕۆیشتو بێ هیوا بوو. لەو کاتەی دەمانویست بڕۆین، پێشەوا بەحەمەد ئاغای وت "بنێرە سەربازخانە ئەو چەکەی دەتانەوێو پێتان دەچێت، بیبەن لەگەڵ خۆتان".

بەدڵێکی تەنگی تەزیوی سارد لەدیوان دەرکەوتینو ماڵئاواییمان لەو کەسە هەڵکەوتووە کردو بەجێمان هێشت... حەمەد ئاغا (مێرگسوری) گوتی "تۆ بڕۆ بۆ سەربازخانە، ئوتومبیلەکەت بار بکە لەتفەنگ و فیشەك. وەرەوە قونقەلا. من لەوێ دەمێنمەوە هەتا بارکت دەگاتە جێ"... لەقونقەلا لام دا لای حەمەد ئاغا. لەخەوم هەڵستاند، پێم گوت " دوو ئوتومبیلم بار کردووە لەفیشەكو کەلوپەلی سەربازی". ناوبراو گوتی"بڕۆ بۆ شنۆ، لەوێ بیدە بەدەستی شێخ سادقو بگەڕێوە. ئوتومبیلەکانیش لەگەڵ خۆت بێنەوە".[1]

---

[1]-زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەرییەکانم لەساڵانی ١٩٤٣- ١٩٧٧دا، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ١٢٧-١٢٩.

لەڕاستیدا ئەو پەرەگرافانەی لێرە لەم سەرچاوەیە وەرگیراون، زانیارییەکی چەوتیش ڕاست دەکەنەوە، چونکە تا ئەم دراییە وا باو بوو کەمەلا مستەفا بارزانی چووە بۆ لای قازی محەمەدو داوای لێ کردووە مەهاباد بەجێ بێڵێ و لەگەڵیان بچێ بۆ سەر سنور. ئەم سەرچاوەیە دەڵێ ئەوەی کەئەم داوایەی لەقازی محەمەد کردووە، مەلا مستەفا نەبوە، بەڵکو محەمەد ئاغای مێرگەسۆری بووە.

دڵسۆزیی محەمەد ئاغای مێرگەسۆری بۆ نیشتمان لەوەدا دەردەکەوێ کەکاتێك حسێنی کوڕی لەبارزان شەهید دەبێ، ئەو لەچیای سەفین بوو، بەرگریی دەکردو نەیدەهێشت هێزەکانی عیراق چیاکە بگرن. زۆر هەوڵیان لەگەڵی دا بوو کە بۆ پرسەی کوڕەکەی بگەڕێتەوە، بەڵام محەمەد ئاغا چەپەرەکانی شەڕی لەداناني پرسە لا گرنگتر بوو.

# بەشی یەکەم

ئەم بەشەی زنجیرەی یاداشتەکانم، لەکاتێکدا دەستی پێ دەکەم کەکاتێکی ناسك‌و گرنگە لەمێژووی پەیوەندییەکانی نێوان کاربەدەستانی بەعس‌و سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد، کاتێکە بەرە بەرە ماوەی دیاریکراوی ڕێککەوتننامەکەی ١١ی ئازار[١] لوول دەدرێتەوەو بەرەو کۆتایی دەچێ‌و ئەو چوار ساڵەی کەتێیدا هێمنی‌و ئاشتی‌و نەبونی شەڕ باڵی بەسەر خاکی عیراق‌و کوردستاندا کێشابوو، بەرەو تەواوبون دەچێ.

لەگەڵ کەمبونەوەی ماوەی دیاریکراو، وا دیارە کەم کەم پەردەکە تەنك دەبێتەوەو بەرەو دڕان دەچێت‌و ئاسۆیەکی تەماوی‌و تاریك‌و بەدفەڕو پڕ خەم‌و خەفەت‌و خوێن‌و فرمێسك لەتەنکایی ئەو پەردەیە دێتە بەرچاو. پاشەڕۆژێکی خوێناوی‌و پڕ حەسرەت بەڕێوەیە کەبۆنی ئاگرو بارووتی لێ دێت[٢].

لەنوسینی ئەم یاداشتانەدا تا بۆم بکرێ، هەڵوێستێکی بێلایەن‌و ڕاستەقینە دەگرمە بەرو بەگوێرەی بۆچون‌و ئاگاداریم، لەهەر باسێکدا بیروڕای خۆم دەردەبڕم.

---

[١] مەبەست بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠یە کەزادەی ڕێککەوتنی نێوان حزبی بەعسی سۆسیالیستی عەرەب‌و پارتی دیموکراتی کوردستانەو تێیدا مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان چەسپێنرا بەو مەرجەی کەچوار ساڵ بۆ جێبەجێ کردنی بەیاننامەکە دیاری بکرێ، بەڵام ماددەکانی بەیاننامەکە لەماوەی چوار ساڵدا جێبەجێ نەکران‌و هەردولا لەبارەی ئۆتۆنۆمییەوە نەگەیشتن بەڕێککەوتن، بۆیە چاوەڕێی ئەوە دەکرا شەڕ لەکوردستان هەڵبگیرسێتەوە.

[٢] هەر واش بوو. پێشبینییەکەی جەوهەر مێرگەسۆری ڕاست دەرچوو.

لەم پێشەکییەدا حەز دەکەم بیروڕای خۆم سەبارەت بەڕێککەوتننامە مێژوییەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش‌و حکومەتی بەعس دەربڕم.

لەدوای چەندین ساڵ خوێن ڕژان‌و ماڵوێرانی‌و کارەسات‌و تێکەڵاوبونی خوێن‌و فرمێسک‌و لەدوای ماوەیەکی کورتی هێمن‌و ئارام‌و پڕ فرتوفێڵ‌و تەڵەکەبازی‌و نیازی بەد لەلایەن حکومەتی دەسەڵاتداری عیراقەوەو لەئەنجامی ماندوبون‌و بێزاریی هەردوولا لەشەڕ، بەتایبەتی بەعسییەکان کە لەتەموزی ١٩٦٨ هاتبونە سەر کورسیی حوکمڕانی لەبەغدا بۆ جاری دووهەم[١]، لەئەنجامی ئەمە لەئەنجامی ئاوات‌و ئارەزووی گەلی عیراق بەکوردو عەرەب‌و نەتەوەکانی تر، ڕێککەوتننامەیەك لەنێوان حکومەتی بەعس‌و پارتی‌و سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستانی عیراق مۆر کرا.

ئەم ڕێککەوتنە کارێکی گرنگ‌و قۆناغێکی مێژوویی بوو کەبۆ گەل‌و شۆڕشی کورد هاتە دی.

بەڵام لێرەدا دەمەوێ پەنجە درێژ بکەم بۆ خاڵێکی گرنگ، ئەویش سادەیی‌و ساکاری‌و فریوخواردنی گەلی کوردمانە بەرامبەر بەدوژمن.

هەر ئەوەندە ڕێککەوتننامەکە مۆر کرا، شەپۆلێکی شادی‌و خوێن گەرمی بڵاو بۆوەو کورتبینییەك کەوتە سەر چاوی گەلی کورد بەسەرکردایەتییەوە (تەنها بارزانی نەبێ[٢])و بەجارێك بەعسی دڕندەو

---

[١] حزبی بەعس لەساڵی ١٩٦٣ بەهاوکاریی ناسیونالیستەکانی عەرەب بەسەرکردایەتیی عەبدولسەلام عارف کودەتای کردو حکومەتی جەنرال عەبدولکەریم قاسمی روخاندو هاتە سەر کار. بەڵام حوکمی بەعسییەکان کورتخایەن بوو هەمووی هەشت مانگی خایاند، چونکە لەکۆتاییدا سەرۆکی کۆمار عەبدولسەلام عارف کودەتای لەسەر حزبی بەعس کردو لەکاری خست. بەڵام لەساڵی ١٩٦٨دا حزبی بەعس بۆ جاری دووەم کودەتای کردو توانی دەسەڵات بگرێتەوە دەست.

[٢] مەبەستی ئەوەیە کەهەموو گەلی کورد لەنیازو مەرامی حزبی بەعس تێنەگەیشتبوو و

خوێنڕێژ بوو بەفریشتەی ئاسمان و بەهەشت کەگوایە دەرگای فیردەوسی بۆ کورد کردۆتەوە. بەعسی سۆسیالیست و دیموکرات بووە دوو وشەی سەر زار و ناو وتار و هەڵبەستەکانی زۆربەی کاربەدەستەکانی شۆڕش. بەعسییەکان بونە فریشتەی ناو خەوی خەڵک و ناو هەر ناوی ئەوان بوو. وەخت بوو بیانپەرستن.

لەو حاڵەتەدا گلەیی لەجەماوەری گەل ناکرێ کەتینو و تامەزرۆی ئاشتی بوون بەڵکو گلەیی لەو کاربەدەست و سەرکردانە دەکرێت کەچارەنوسی گەلێکی مەزنیان بەدەستەوەیە و گەلی کورد چاوی لەهەوڵ و هیممەت و رابەریی ئەوانە، ئەو کاربەدەستانەی کەخۆیان بەفەیلەسوف و زاناکانی جیهان ناگۆڕنەوە و شەرم دەکەن خۆیان بهێننە ریزی مەزنترین سەرکردەکانی جیهان. ئەمانە بۆچی بەر لەهەموو کەسێك خۆیان و زانین و بەسەرهاتی نۆ ساڵی لەمەوبەر و بەسەرهاتی دەیان شۆڕش و کودەتایان لەبیر چۆتەوە؟.

بەهەر حاڵ، ئەوەندە بە بەژن و باڵای بەعسیان هەڵگوت، بەعسییەکان لێوی خۆیان گەست و بزە کەوتە سەر لێویان و لەخۆبایی بونی پێشڕەوییان کەوتە ناو بیر و هۆش.

واتە، بەکورتی، بەعس سەرکردایەتیی شۆڕشی هەڵسەنگاند (بارزانیی لێ دەرچێ) و زانی ئەو سەرکردایەتییە بایی چەندە و لەسەر ئەو بنچینەیە کەوتە گفتوگۆ و لەسەر ئەو بنچینەیەش هاوکاریی لەگەڵ ئەو

---

تەنها بارزانی سەری لەنیاز و مەرامی حزبی بەعس دەرکردبوو. دیارە ئەم لێکدانەوەیە زێدەڕۆیی پێوە دیارە چونکە زۆرینەی گەلی کورد متمانەی بەحزبی بەعسی نەبوو و بەچاوی گومانەوە هەنگاوەکانی هەڵدەسەنگاند. بۆیە بەگومان کەوتن لەحزبی بەعس دیاردەیەکی گشتی بووە. ئەوە راست نیە کەتەنها لەنێو کورددا تەنها یەك کەس بەعسی ناسیوە.

سەرکردایەتییە بەست، هەرچەند لەڕوی دبلوماسیەتەوە بەعس خۆی وەك هاوکارێکی یەکسان پیشان دەدا.

لێرەدا نامەوێ باسی ئەوە بکەم کەبەعسییەکان لەماوەی هێمنیو ڕێککەوتننامەکەدا چیان کردووەو هەڵوێستیان بەرامبەر بەدوو هێڵی دژ بەیەك چۆن بووە بەڵام ئەوە دەڵێم کەهەموو کەسێك لەو کوردستانە ئاگاداری هەموو کارێکی نامرۆڤانەی بەعس بووە بەرامبەر بەگەلی کوردو پارتیو شۆڕش لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی.

لەسنوری ماوەی دیاریکراوی ئەو ڕێککەوتننامەیەدا کەچوار ساڵ بووە، چەندین جار پەیوەندیی نێوان هەردولا نزمو بەرزبونەوەو شلو توندیی بەخۆیەوە دیوە، جا ئەوە چ لەئەنجامی دژییەکیی بیروباوەڕ بێ چ ـ ئەنجامی بەدکاریو بەد هەڵوێستیی بەعسییەکان بوو بێ، تەنانەت لەساڵی ١٩٧٢دا پەیوەندییان گەیشتە رادەی پچڕانو هەڵوەشانەوە، پاشان هاتەوە سەر ڕێڕەوی جاران.

هەڵبەت کارو کردەوەی هەموو کەسێك یان کۆمەڵێك یان پارتێك ڕەد فیعلی تەکوینو تەرکیبو بیرو هۆشو تیۆریی سیاسەتی کەسەکە یان کۆمەڵو دەستەو پارتەکەیە، واتە کردەوە لەخاوەنی کردەوەکە جیا نیەو کردەوە لەشوێنێك نیەو خاوەنەکەشی لەشوێنێکی تر بێ، بەڵکو کردەوە تەعبیرە لەئەساسو تەکوینی ئەوەی کەئەنجامی دەدا.

کەواتە بۆچی چاو لەحەقیقەتی بەعس دەپۆشینو کردەوەکانی لەیادی خۆمان دەبەینەوە؟ ئەو بەعسییانەی کەپیلانی لەناوبردنی سەرکردەی شۆڕشیان دانا[1]، تەقەیان لەئوتومبیلی ئیدریس بارزانی کرد[2] و لەسەرەتای

[1] مەبەست هەوڵی کوشتنی مەلا مستەفا بارزانییە لە٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ لەحاجی ئۆمەران کەدەستی رژێمی بەعسی تێدا بوو.

[2] لەڕاستیدا هەوڵی کوشتنی ئیدریس بارزانی لەبەغدا دەستی حزبی بەعسی تێدا نەبوو،

ڕێککەوتنەکەشدا پەلاماری بارەگای لقی یەکی پارتییان دا، دواتریش پەلاماری لقی سێیان دا ، ئینجا کەوتنە کوشتن‌و بڕینی ئێزیدییەکانی شنگال، کەوتنە کارکردن بۆ بەعەرەب کردنی ناوچەکانی کوردستان، دەستیان بەگرتن‌و ڕفاندن‌و کوشتنی کوردپەروەران‌و ئەندامانی پارتی‌و هاندانی جاش‌و خۆفرۆشەکان بۆ پەلاماردان‌و لێدانی خەڵکی بێدەسەڵات‌و دابەش کردنی هەزارەها دینارو چەك بەسەر کرێگرتەکانیاندا، کەوتنە داخستنی بارەگاو بنکەکانی پارتی‌و شۆڕش لەشارەکان‌و داخستنی ڕۆژنامەکانی سەر بەشۆڕش‌و کڕینی نەفس نزمەکان‌و ئەنجامدانی هەزارەها کردەوەی تر.

ئایا ئەمانە هەمووی بەڵگەی حەقیقەتی بەعس نین؟ ئایا ئەمە پێویستی بەشاهێدە؟ ئایا لەم کردارانە زیاتر، چیتر دەبێ ئیدانەی بەعسییەکان بکات؟ ئەگەر چاو لەم کردەوانە بپۆشین، حیسابی وردیان بۆ نەکەین‌و شیکردنەوەی وردیان بۆ نەکەین، چۆن دەتوانین خۆمان بەرابەرو خزمەتکارو تێگەیشتووی ئەم میللەتە بزانین؟

لێرەدا دەتوانم بڵێم شۆڕش بەشێوەیەکی دوورپەرێزو دوور لەواقیع‌و

---

بەڵکو هەوڵێکی عەشیرەتگەری بوو بۆ تۆڵە سەندنەوە لەمەلا مستەفا بارزانی. ئەنجامدەرانی هەوڵەکە زێباری بوون‌و ڕابەرەکەیان عاسف ئەحمەد زێباری بوو کەمەلا مستەفا بارزانی لەساڵی ١٩٥٩ باوکی لەموسڵ کوشتبوو. کوڕەکەشی بەدوای هەلێکدا دەگەڕا بۆ تۆڵە سەندنەوە. بۆیە کاتێك زانی ئیدریس بارزانی لەبەغدایە، بۆسەی بۆ داناو بەهاوکاریی چەند کەسێك پلانی کوشتنی دانا. بەڵام ئەو کەسەی کەتەقەی لێ کرا، ئیدریس بارزانی نەبوو بەڵکو کەسێکی تر بوو، چونکە لەو کاتەدا ئیدریس بارزانی گەڕابۆوە بۆ حاجی ئۆمەران. هەوڵی کوشتنەکە لە٦ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠ بوو. ئەنجامدەرانی هەوڵەکەش گیران‌و لەبەغدا دادگایی کران. عاسف سزای زیندانی ئەبەدیی بۆ دەرچوو، هاوەڵەکانیشی بەحەوت ساڵ زیندانی کردن سزا دران.

بەشێوەیەکی وشك‌و یەکلایەنە سەیری بەعسییەکانی کردووە، واتە شۆڕش لێکدانەوەی دروستی بۆ بەعسییەکان نەبوەو نەشیناسیون.

بەر لەوەی بەجۆرە خۆمان فریێ بدەینە باوەشی بەعس‌و بکەوینە پێداهەلگوتن‌و دەست بەهاوکاری‌و دۆستایەتییان بکەین، دەبوایە بەشێوەیەکی زانستییانە دیراسەتی تەرکیب‌و بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیای بەعس بکەین، ئەویش لەسەر بنچینەی واقیعی‌و کردەوەیی‌و مێژوویی‌و دەرونی.

ئەگەر بەوردی‌و بەلێکدانەوە ناکۆکیی ئایدیۆلۆژیی نێوان بەعس‌و پارتی بەشێوەیەکی زانستیانە هەلبسەنگێنرایەو بایەخی تەواو بەتاوتوێ کردنی ئەو ناکۆکییە بدرایەو حەقیقەتی بەعسییەکان‌و حەقیقەتی کێشەی کوردو چۆنێتیی چارەسەرکردنی کێشەی کورد شی بکرایەتەوەو هەلسەنگاندنی وردو زانستییانە بۆ خاسیەتی رەگەزپەرستیی بەعس بکرایە کەجۆرە بیروباوەرێکە لەگەڵ بیروباوەڕی خاوێن‌و کوردایەتی ناگونجێ، ئەگەر بایەخی تەواو بەمە بدرایە، لام وایە فریو نەدەدراین‌و خۆمان بەدامێنی کەرەم‌و جوامێری‌و دیموکراتیەتی بەعسییەکان هەلنەدەواسی، هەر نەبوایە بەورییاییەوە هاوکاریمان دەکردن‌و لەهەر کردەوەیەکی نابەجێدا پەنجەی کاراو بەهێزو راستەقینەمان دەخستە ناو چاویان‌و دەمانزانی مەسەلەی کورد چۆن چارەسەر دەکرێت.

دەبوایە بمانزانیایەو حیسابمان بۆ ئەوە بکردایە کەدژیەکیی بیروباوەڕی جۆربەجۆرو ناکۆکیی نێوان هەردوو حزب کەرەنگدانەوەی تیۆری‌و زانستی‌و دەرونیی هەردولایە، واتە ناکۆکیی نێوان کۆن‌و تازەو ناکۆکیی نێوان رۆیشتن لەگەڵ کاروانی هاوچەرخ‌و لێکدانەوەو شیکردنەوەی پێشکەوتنی کۆمەلگای مرۆڤ‌و پاچەقاندن لەسەر پایەی نزمی دواکەوتن، ئەوە دەسەلمێنێ کە بەعس‌و پارتی هەر یەکەیان لەتای تەرازوویەکدان، چ

سەبارەت بەچارەسەکردنی کێشەی نەتەوەیی چ سەبارەت بەشیکردنەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و چ سەبارەت بەجێبەجێ کردنی دیموکراسیەتی راستەقینە بۆ گەل.

ئەو ناکۆکی‌و دژیەکییەی کەهەیە لەنێوان بیروباوەڕی خاڕێن‌و پێشکەوتوخوازانەی پارتی‌و نێوان بیروباوەڕی تەسك‌و رەگەزپەرست‌و دواکەوتوی فاشیستانەی بەعس سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد، لەڕێگەی شەڕو شۆڕشی نەتەوەییەوە چارەسەر دەکرێت هەروەك ئێستا گەلەکەمان پێوەی سەرقاڵە.

دەست دانە چەك کاردانەوەو چارەسەری دواییە بۆ مەسەلەی کورد بەرامبەر بەو رژێمەی دەستی داوەتە چەك بۆ لەناوبردنی گەلی کوردو کێشەی کورد، چونکە ئاسن بەئاگر نەرمترو ملکەچترە، ئەویش لەژێر زەبری چەکوچ.

بەعسییەکان وەك هەر حکومڕانێکی تری بەغدا چاویان بڕیوەتە یەك شت، ئەویش چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردە بەئاگرو ئاسن‌و دەمکوت کردنی شۆڕش‌و گەلی کوردو بیر لەوە دەکەنەوە کەدەبێ تەنها یەك هێز لەعیراق هەبێت ئەویش خۆیانە. هەڵبەت ئەمەش هەڵەیەکی مێژوویی‌و زانستییە کە لەگەڵ ئەم چەرخەدا ناگونجێ. دەبوایە بەعسییەکان حیساب بۆ هەموو قۆناغێك بکەن لەو قۆناغانەی کەشۆڕشی کوردی پێدا رەت بووەو رەت دەبێ. نابێ بەهەمان چاوی ساڵەکانی ۱۹٦۳و ۱۹٦٤و ۱۹٦٦و ۱۹٦۸ سەیری کێشەی کورد بکەن. چەند حکومەتەکانی بەغدا لەگۆڕاندا بن، ئەوەندەش شۆڕشی ئێمە هەنگاوی زیاتر بۆ پێشەوە دەنێ، بەڵکو دەبێ حیساب لەپلەیەکی بەرزەوە بێت کەئێستا شۆڕشی ئێمەی تێدایە، چ لەڕوی عەسکەری‌و ماددییەوەو چ لەڕوی توانای مەعنەوی‌و پاڵپشت کردنی گەلی کورد بۆ شۆڕش‌و پارتی‌و چ لەڕوی ئەوەی کەهەموو گەلانی

جیهان چاویان بڕیوەتە کێشەیەکی مەزنو عادیلانە کەکێشەی کوردە.

بۆ نمونە، لەیەکەم وتووێژی ساڵی ١٩٦٣ی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشو رژێمی بەعسییەکان، داخوازییەکانی شۆڕشی ئێمە لەچەند خاڵێك زیاتر نەبوو کەزۆربەیان هەر لەئەنجامی شەڕدا هاتبونە کایەوە، تەنها هەندێ داخوازیی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو ئیداری نەبێ.

لەوتووێژی ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ حکومەتی عەبدولسەلام عارف[1]، داخوازییەکان گۆڕانێکی گرنگیان بەسەردا نەهاتبوو، کەچی دەسەڵاتداران بەم داخوازییانە رازی نەبونو لەهەردوو جاردا بەهەموو توانایانەوە پەلاماری کوردستانیان داو بەئاگرو ئاسن کەوتنە دەمکوت کردنی گەلو شۆڕشی کورد بەڵام هەوڵدانیان بەبادا چوو.

هەروەها لەوتووێژی ١٩٦٦دا داخوازییەکانی گەلی کورد بۆ جێبەجێ کردنی حوکمڕانیی لامەرکەزی بوو[2] و لە١٢ خاڵی گرنگ پێك هاتبوون

---

[1] عەبدولسەلام عارف سەرۆکی کۆماری عێراقە لەماوەی ساڵانی ١٩٦٣- ١٩٦٦. لەساڵی ١٩٢١ لەبەغدا لەدایك بووەو خوێندنی لەبەغدا تەواو کردوەو پاشان لەکۆلیجی سەربازی وەرگیراوەو بۆتە ئەفسەر لەسوپای عێراق. لەساڵی ١٩٥٨ خۆیو عەبدولکەریم قاسم رابەرایەتیی شۆڕشی ١٤ی تەموزیان کردو رژێمی پاشایەتییان روخاندو کۆماریان لەعێراق راگەیاند. لەساڵی ١٩٦٣ هاوپەیمانیی لەگەڵ حزبی بەعس بەستو پێکەوە کودەتایان لەدژی عەبدولکەریم قاسم کرد. لەئەنجامدا بووە سەرۆکی کۆمار، بەڵام هەر ئەو ساڵە لەبەعسییەکانەوە هەڵگەڕایەوەو لەحوکم دەری کردن. لەساڵی ١٩٦٦دا بەڕوداوی کەوتنەخوارەوەی هەلیکۆپتەر لەباشوری عێراق گیانی لەدەستدا. بەبیروباوەڕ، ئیسلامیستێکی توندڕەو و ناسیونالیستێکی ناسریست بووە، زۆر رقی لەگەلی کورد بووە. ماوەی حوکمڕانیی ماوەیەکی بێ دیموکراسی بووە.

[2] مەبەست لەحوکمڕانیی لامەرکەزی، پێدانی هەندێ دەسەڵاتی ئیدارییە بەپارێزگاکان. لەعێراق وا باو بوو کە بەلامەرکەزیەت چارەسەری مەسەلەی کورد دەکرێت. ئەو مافانەی کە لەبژاردەی لامەرکەزیەت نیاز وابوو بەکورد بدرێن، مافێکی زۆر کەم بوون. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گروپە ناسیونالیستە توندڕەوەکانی عێراق دژی ئەوە بوون

بەڵام ئاسانو عادیلانە بون، کەچی حکومەتی عەبدولڕەحمان عارف[1] بەمەش رازی نەبوو و دیسان خۆیان تاقی کردەوەو کوردو گەلی عیراقیان خستەوە ناو گێژاوی خوێن رشتنو کارەسات. ئەمیش سەری نەگرتو سەری بێ مێشکیان لەشاخو بەردی رەقو سەرکەشی کوردستان داو شکستیان هێنا.

ئینجا دوا بەدوای ئەوان، لەساڵی ١٩٦٨ جارێکی تر بەعسییەکان بەهۆی هەندێ کەسی عەسکەریو ناسراو هاتنەوە دەسەڵاتو کەوتنە خۆچەسپاندن. ئەمانە لەجیاتی ئەوەی پەند لەڕابردویان وەرگرنو حەقیقەتی شۆڕشی کورد تێبگەن، بەردەوام بون لەسەر شەڕ، ماوەیەکی کورت نەبێ تاکو خۆیان قایم کرد.

لەدوای ئەوەی سەرکێشیو لەخۆبایی بونیان بۆ نەچوە سەرو مەترسییان لەبونو مانیان پەیدا کردو دیتیان شۆڕشی کورد شۆڕشی جاران نیەو بۆتە قەڵایەکی پۆڵاینو لەناو ناچێ، ناچار بون سەرو لوتی بەرزیان دانەوێننو دەست بەگفتوگۆ بکەن لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشو ناچار بون لەجیاتی داخوازیی ئیداریو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو داخوازیی لامەرکەزی، ئیستیعابی قۆناغێکی تری داخوازییەکانی گەلی کورد بکەن، ئەویش داننانە بەئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کوردو دانیان بەوەدا نا کەسەرکرایەتیی شۆڕش خاوەنی دەسەڵاتەو بەبێ ئەو سەرکردایەتییە ناکرێ روو بکەنە هیچ دەستەو دایەرەیەکی تر.

---

سیستمی لامەرکەزی لەعیراق پیڕۆ بکرێو نەیاندەویست تەنانەت ئەو مافە ئیدارییە کەمەش لەسایەی لامەرکەزیدا بەکورد ببەخشن.

[1] عەبدولڕەحمان عارف دووەم سەرۆکی کۆماری عیراقە. لەساڵی ١٩٦٦ پاش مردنی عەبدولسەلامی برای، بەبێ هەڵبژاردن هاتە سەر کارو تا ساڵی ١٩٦٨ لەسەر حوکم مایەوە. لەساڵی ١٩٦٨ بەعسییەکان کودەتایان لەدژی کردو بۆ دەرەوەی عیراق دووریان خستەوە.

کەواتە دەبێ بەعسییەکان حیساب بۆ ئەم قۆناغە بکەن نەوەك بەچاوی قۆناغەکانی پێشوو سەیری مافە رەواکانی گەلی کورد بکەن. دیارە گەلی کورد شەڕ بۆ ئەوە دەکات سنور بۆ شەڕ دابنێت.

ئەگەر بهاتایە لەسەرەتای وتووێژەوە بەچاوێکی زانستییانە سەیری پێکهاتەو ئایدیۆلۆژیای بەعسییەکانمان بکردایەو بەقوڵی دابەزی بووینایەتە ناو جەرگەیان، یەکسەر بۆمان دەردەکەوت کەبەعسییەکان چین‌و چییان لەبار دایە. ئەوسا لەسەر ئەو بنچینەیە حیسابمان بۆ دەکردن‌و خۆمان ئامادە دەکرد.

مەدحی خۆم ناکەم ئەگەر بڵێم من هەر لەسەرەتای وتووێژەوە بەچاوێکی زانستی سەیری پێکهاتەی نەفسی‌و ئایدیۆلۆژیی بەعسییەکانم کردووەو هەر لەسەرەتاوە رای خۆم دەربڕیوە سەبارەت بەسەرنەکەوتنی وتووێژ کەوەك هەر وتووێژێکی پێشوو هات‌و رەت بوو. بەڕای من وا چاك بوو شان بەشانی وتووێژ، شەڕیش هەر بەردەوام بوایە تاکو لەجیاتی ئەوەی حکومەت مەرج بەسەرماندا بسەپێنێ، ئێمە مەرجمان بەسەردا بسەپاندایەو ناچارمان بکردایە دان بەهەموو شتێکدا بنێ کەخێری گەلەکەمانی تێدایە. ئایا رژێمێك بیەوێ مافی نەتەوەیی بدا، چۆن لەناوهێنانی وشەی کوردستان دەسڵەمێتەوە؟ بەڵام لەبەر ئەوەی لەناخی خۆیدا دانی بەو راستییەدا نەنابوو، مەگەر بەشێوەیەکی سەرپێ یی نەبێ، لەجیاتی وشەی کوردستان دەیگوت باکوری عیراق‌و باکوری خۆشەویستمان‌و باکور بەشێکی نیشتمانەو لێی جیا ناکرێتەوە.

بەهەر حاڵ، وا نەبێ ئەمە بنچینەی تەقدیرمان بێت بۆ بەعسییەکان بەڵام واقیع ئەوەی سەلماند کەئەوان ناپاکن لەگەڵ کورد.

لەیەکەم رۆژی کردنەوەی رێگای رەواندزو دەستپێکردنی هاتوچۆ بۆ ناوچەی ئازادکراوی باڵەك، لەسێرپیانی خەلەکان‌و بیشۆك توشی برادەرێکی

کۆنی خۆم بووم کەسێ ساڵ پێکەوە ئازاری زیندانمان لەبەندیخانەکانی عیراق کێشاوە. لەوکاتەدا لەهەموو وتووێژێکدا پرسیاری رای منی دەکرد.

لەوەڵامدا بۆم دەسەلماند کەوتووێژەکە ماوەی پشودانو حەسانەوەیە، سوپای حکومەت بۆ کۆکردنەوەی هێزو توانا بۆ پەلامارێکی دڕندانەتر بۆ سەر خاکی کوردستان دروستی کردووە. لەهەموو پێکهاتنو ئاگربڕێکدا ئەمە رای من بووە. ئازاد کراینو لەیەك جیا بوینەوە. ئەو بۆ رەواندزو منیش بۆ مێرگەسۆر. نیتر چاوم پێ نەکەوتەوە تا ساڵی ١٩٧٠ کاتێك رێگای رەواندزو گەلاڵە کرایەوە.

لەسێڕیانەکە توشی بومو پڕ بەدڵ لەباوەشی گرتم. لەخۆشیی رێککەوتننامەی ١١ی ئازار کەوی خۆشی لەسەر سمێڵەکانی سەمای دەکردو هەر پێدەکەنی. دوای چاكو خۆشی، هەمان پرسیاری لێ کردمەوە.

-خۆ ئێستا هیچ نەماوەو ئەم وتووێژە دەبێتە دوا وتووێژ لەمێژوی گەلو شۆڕشی کورد.

هەمان وەڵامم دایەوەو پێم گوت:

-عەزیزم دەبێ هەر ئەوەندە دڵمان بەم وتووێژە خۆش بێت تا بەعسییەکان خۆیان ئامادە دەکەنو بەتەواوی دەست بەسەر عیراقدا دەگرن. ئەوانە بەنیازێکی کاتی هاتونەتە پێش. تەمەنی ئەم وتووێژە لەهەموو وتووێژەکانی پێشوو درێژتر دەبێت بەڵام پەلامارو هێرشی دوای وتووێژەکە لەهەموو پەلامارو هێرشێکی تر خوێناویترو دڕندانەتر دەبێت. بەعسییەکان زیانبەخشترن.

بەهەر حاڵ، شۆڕش لەقۆناغی وتووێژدا کەوتە قۆناغێکی هەستیارترو گرنگتر، ئەویش قۆناغی شەڕی سیاسییە کەئێمە تێیدا لەدوژمن لاوازتر بوین. دەتوانم بڵێم ئەوەندەی دوژمن ئێمەی دەناسی، ئێمە ئەوەندە ئەومان نەدەناسی.

دوژمن کەوتە داپچڕاندنی کاربەدەستانو سەرکردەکان لەجەماوەری گەلو پێشمەرگە. پێشمەرگە پشت گوێ خرا، کاریان پێ نەماو حیساب بۆ ئەوە نەکرا کەدوارۆژێکی سەخت لەپێشەو هەر ئەم هێزە پۆلایینەی پێشمەرگە دەتوانێ بەرامبەر دوژمن بوەستێتەوەو بەرگری لەمافو بوونی گەل بکات.

بەلاَم بەپێچەوانەوە، پێشمەرگە چەوسێنرایەوەو هەزارەها خێزانی شەهیدان لەبیر کرانو کار گەیشتە ئەوەی کەهەر یەکە خۆی بژیەنێ. لێرەدا دوژمن هەلەکەی قۆستەوەو کەوتە کڕینی ئەمو ئەو و هێنانە ریزی خیانەتو خراپکاری لەگەڵ شۆڕش. هەزارەها دیناری لەم ڕێگایە خەرج کرد. هەلَوێستی دوورەپەرێزی کاربەدەستانمان لەجەماوەری گەلو پێشمەرگە بووە هۆی دلَڕەشبونو بێ ئومێدی. پێشمەرگە لێوی خۆی گەستو تێگەیشت کەچارەنوسی بەدەستی برا گەورەکانی بەچی دەگات، بۆیە کەوتە ئەوەی بلێت: ژیان دوورو درێژە. ڕۆژێك دادێ لێتان بقەومێو کارتان بەئێمە بێت.

هەلَوێستی کاربەدەستان پەردەیەکی کەم باوەڕیی لەنێوان پێشمەرگەو ئەواندا دروست کرد. هەر ئەوەش زۆر کاری کردە سەر شەڕی داهاتوو. هەر بۆ نمونە، لەسالَی ١٩٧١دا سەردانی شاری زاخۆم کرد. توشی چەند پێشمەرگەیەکی ناسراوی هێزەکانی کاوەو رزگاریو خەبات بوین. زۆر بەیەکتری شاد بوین. دواتر کەمێك بەپیاسە گەشتێکی ناوشارمان کردو بەرەو پردی عەباسیە[1] چوین. بەر لەوەی بگەینە پردەکە، دیمەنی خانویەکی

[1] مەبەست لەپردی عەباسیە پردی دەلالە (پرا دەلال) لەسەر روباری خابور لەزاخۆ. وا باوە کەئەم پردە عەبلسییەکان دروستیان کردووە یان لەسەردەمی عەباسییەکان دروست کراوە بەلاَم ئەمە راست نیە چونکە زانیاریی مێژویی ئەم پردە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی رۆمانەکانو هەندێ سەرچاوە دەلێن پردەکە لەسەردەمی میرنشینی ئامێدی

زۆر جوان سەرنجی راکێشام. قەسرێکی درو قاتی زۆر گەورەو بەرزو جوان بوو.

پرسیارم کرد داخوا هی کێیە. "یەکێکیان وتی بڵێم هی کێیە؟ هی یەکێکە لەکادیرە کاربەدەستەکانمان. پێشمەرگە بوو لەگەڵ منو لەیارمەتی[1] زیاتر هیچی نەبوو. بوو بەکادیر، ئینجا سەرلقو لەگەڵ کاربەدەستان دەستی تێکەڵاو کرد. شەڕ وەستاو چووە شار. زۆری نەبرد دەستی بەدروست کردنی ئەم قەسرە کرد".

پێشمەرگەکە بەشێوەیەکی سادەو ساکارو بەلەهجەی زاخۆیی کەوتە قسەو گوتی "کوڕو تور ئەڤ پارە لکیجی هینان؟ تور کەنکی هۆ رازاندە؟ تور بچی هوتوڤە شوشەبەند کردو چیمەنتو کردو رازاندڤەو ئەڤ پەنجەرو دەرگەهێت هوت عەجیب پیڤە کرن. تور بچی هوتوڤە کەسکو سۆر کردو دیواری وی نەخشاند".

پاشان روی کردە منو گوتی "ئەڤەیە فەرقا مەسئولو پێشمەرگەهاو پێشمەرگەو کاربەدەست". هەر ئەم حاڵە بوو کە لەکاتی شەڕ دەستپێکردنەوەدا، کاتێ سوپای بەعس هێرشی هێنایە سەر گەلی زاخۆ، رای کرد بەبێ شەڕ گەلی زاخۆ بگیرێتو وەك ئەوە وابوو کەسی لەپێش نەوەستا بێت[2].

---

دررست کراوە، بەڵام دەشێ لەو کاتەدا پردەکە هەبوو بێو مێرێکی نامێدی دەستی پێدا هێنا بێ بۆ ئەوەی نەڕرخێ.

[1] مەبەست لە "یارمەتی" مووچەی زەمانی پێشمەرگایەتییە.

[2] لەنیسانی ١٩٧٤دا سوپای عیراق نەخشەی گرتنی دەربەندی زاخۆی دانا. پاش ئەوەی کەشەش سەعات بەتۆپو فرۆکە دەربەندەکە بۆردومان کرا، سوپا وردە وردەو بەترسو لەرزەوە پێشڕەوی کرد. دواتر بۆی دەرکەوت هیچ پێشمەرگەیەك لەدەربەندەکە نیە چونکە پێشمەرگەکان بەبێ شەڕ دەربەندەکەیان چۆڵ کردبوو. بەمجۆرە، بەبێ شەڕ دەست بەسەر دەربەندەکەدا گیراو پاشانیش بەبێ شەڕ دەست بەسەر شاری زاخۆدا گیرا.

کەپرسیاریان لەپێشمەرگەکان دەکرد بۆچی شەڕتان نەکرد، لەوەڵامدا دەیانگوت "با ئەوانە شەڕ بکەن کەخاوەنی قەسرو قسورو ترۆمبێلن".

نمونەیەکی تری جیاوازیی نێوان پێشمەرگەو کاربەدەستان: پێشمەرگەیەك دەچێتە بەغدا بۆ لای یەکێ لەوەزیرەکانمان تاکو کارێکی بۆ بڕوێنێت. پاش هەفتەیەك هاتوچۆو سکاڵاو پێشنیار پێشکەش کردن، هیچی بۆ نەکرا. ناچار بوو لەسەر شۆستەی شەقام لەبەر دەرگای وەزارەت ڕابوەستێ تاکو وەزیرە کوردەکە لەدایەرە دەردەچێ. لێی دەچێتە پێش‌و دەڵێ: "قوربان، کارەکەت بۆ جێبەجێ نەکردم". وەزیریش دەڵێ " بابم، حکومەت نایکات". ئەویش دەڵێ "قوربان ئەی ئێوە چین لێرە؟". وەزیریش وەك ئەوەی بیەوێ پێشمەرگەکە لەداخوازییەکەی بێئومێد بکات دەڵێ "بابم، حکومەت بەهێزەو بەتۆپ‌و دەبابە هاتۆتە سەر حوکم". پێشمەرگەکەش بەتەوسەوە لەناو قەرەباڵغییەکە یەك دوو جار سوڕ دەداو دەداتە پەنجە تەقەو دەڵێ "کەواتە دیارە ئێوەش بەچەقەنە لێدان هاتونەتە سەر حوکم".

وەنەبێ مەبەستم ئەوە بێ تانە لەشۆڕش بدەم‌و بێئومێد بووبم لەشۆڕش بەڵام من ئەوە باس دەکەم کەباو بووە. هەموو کەسێك لەڕۆژێکدا دەیان جار دەیدیت‌و دەیبیست. ئەم جۆرە دیاردانە هیچ کاتێك لەگەڵ ڕێبازی شۆڕش‌و شۆڕشگێڕی ناگونجێن. هەرچەند ئەم دیاردانە تەئسیریان لەسەر ڕژێمێکی دامەزراو کەمە بەڵام مەسەلەکە بۆ شۆڕشی گەل کەخۆبەخت کردن‌و خۆبەکوشتدان شتێکی ئارەزومەندانەیە شتێکی جیاوازەو بەزیان بۆ یەکێتیی ریزەکانی پێشمەرگەو گوێڕایەڵی بۆ سەرکردایەتی دەگەڕێتەوە.

---

دەرکەوت پێشمەرگەکان لەڕقی فەرماندەی بەرەکە عیسا سوار شەڕیان نەکردووە چونکە زۆر ڕقیان لێ بووەو بەپیاوێکی گەندەڵ‌و دزیان زانیوە. بەهۆی ئەمەوە، ئەرکی خۆیان بەجێ نەهێناو بەخشکەیی لەبەرەی شەڕ کشانەوە.

دڕندەیی بەعس هەموو خەڵکی تۆقاندبوو. بەدرێژایی ساڵانی ئاشتی، وەجبە وەجبە تەرمی سەدەها کوژراو فڕێ دەدرایە سەر جادەو کۆڵانو دەرەوەی شارەکان کە لەقەسری نیهایە[1]و شوێنەکانی تری لێکۆڵینەوە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا دەکوژران. ئەم ڕەفتارانە بوونە هۆی کشانەوەی خەڵك لەحکومەتو هەموویان چاویان بڕی بووە شۆڕش کەپەناگای ئارامی خەڵکە.

لەساڵی ١٩٧٣ گفتوگۆ لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستانو حزبی بەعس بۆ جێبەجێ کردنی ڕێککەوتننامەکەو دیاریکردنی ئۆتۆنۆمی دەستی پێ کرد[2]. بەڵام دەرکەوت هیچ هەنگاوێکی ئومێدبەخش

---

[1] قەسری نیهایە شوێنی گرتنو ئەشکەنجەدانی گیاوە سیاسییەکان بوو لەبەغدا. ناظم گزار بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کردبووی بەبارەگای خۆی. دەیان گیاوی سیاسی لەو گرتوخانەیە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەست داوە. گرتوخانەکە لەبنەڕەتدا کۆشکێکی پاشایەتی بوو. ساڵی ١٩٣٧ دروست کراوە، ئەویش بەسەرپەرشتیی میر عەبدولئیلا. ئەوسا پێی دەگوترا کۆشکی ڕیحاب کەناوی گوندێکە لەنزیك شاری تایف لەسعودیە. بنەماڵەی پاشایەتیی عیراق بەڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر ئەو گوندە.

لەساڵی ١٩٥٨ لەکاتی کودەتای سوپادا ژمارەیەك لەئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتیی حوکمڕان لەو کۆشکە کوژران، بۆیە کۆشکەکە ناو نرا قەسری نیهایە واتە "کۆشکی کۆتایی".

لەساڵی ١٩٧٣دا پاش شکست هێنانی کودەتاکەی ناظم گزار، حکومەتی بەعس کۆشکەکەی ڕوخاند.

[2] بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ چوار ساڵی بۆ وتووێژ بۆ جێبەجێ کردنی ئۆتۆنۆمی دیاری کردبوو. کەچی بەدرێژایی سێ ساڵ، پارتی هیچ وتووێژێکی لەم بارەیەوە نەکردو لەساڵی ١٩٧٣دا، لەکاتێکدا کەخەریك بوو ماوەکە بەرەو کۆتایی دەچوو، کاربەدەستانی پارتی بەپەلەپڕوزێ کەوتنە وتووێژ. کاتێکیش هەستیان کرد کات بۆ گەیشتن بەڕێکەوتن نەماوە، پێشنیازیان کرد ماوەی وتووێژ بۆ یەك ساڵی دیکە درێژ بکرێتەوە بەڵام بەعس ئەمەی ڕەت کردەوە.

نەهاوێژراوە. لەهەر گەڕانەوەیەکی وەفدی شۆڕش کۆسپی تازە ئاشکرا دەبوو تا وای لێهات ڕێژەی ئومێدی ڕێککەوتن گەیشتە ٣٠٪و بەرە بەرە کەمتریش بووەوە تا لەمانگی شوباتدا[1] گەیشتە نزیکەی ٥٪، ئینجا هاتوچۆش قەدەغە کراو پەیوەندی بەتەواوی بڕا. تەنها شت کەمابوو چرایەکی کزو لاواز بوو لەتاسۆدا. بەڵام ئەم چرایەش بەگەڕانەوەی کاك ئیدریس لەبەغداوە کوژایەوە[2]. چۆن چوو، بەو جۆرەش گەڕایەوەو حکومەت یەك تۆزقاڵ هەڵوێستی خۆی نەگۆڕی.

خەڵك دەستیان کرد بەهەڵاتن لەشارەکانو باریان کرد بۆ ناوچە ئازاد کراوەکان. هەموو ڕۆژێك سەدەها خێزان لەهەموو شارەکان دەهاتە دەر بەبێ ئەوەی حکومەت هیچ کەسێك قەدەغە بکات، هەروەك بیەوێ لایەنگرانی شۆڕش لەناو شارەکان نەمێنن. دەڵێن سەددام حسێن گوتبوی "باشتر وایە دوژمن لەسەنگەرێك بێتو ئێمەش لەسەنگەرێك بین".

هەڵبەت ئەو خەڵکە کەڕایدەکرد هیواو ئومێدێکی بەرزی بەشۆڕش هەبوو. زۆربەی خەڵك وای دەزانی شەڕی ئەمجارەمان لەچەند مانگێك زیاتر دەوام ناکات بەڵکو کەمتریش. بۆیە بەسەدان کاربەدەستو فەرمانبەرو قوتابیو مامۆستاو مامۆستای زانکۆو ئەندازیارو پارێزەرو پزیشك پاڵیان دا بەشۆڕشەوە. سەدەها پۆلیس هاتنە ناو شۆڕشو کەوتنە جبەخانە شکاندنو ڕفاندنی چەكو شتومەكو دەیان ترومبێلی سەر بەدایەرەکان

[1] مەبەست شوباتی ساڵی ١٩٧٤ـــە.

[2] مەلا مستەفا بارزانی بەڵێنی لەشای ئێرانو ئەمریکاو ئیسرائیل وەرگرتبوو کەئەگەر شەڕ دەست پێ بکاتەوە یارمەتیی دەدەن، بۆیە مەلا مستەفا نەیدەویست درێژە بەوتووێژ لەگەڵ عیراق بداو بڕیاری شەڕی دابوو. بەڵام لەژێر فشاری ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی، ناچار بوو ئیدریسی کوڕی بۆ دوا جار بنێرێ بۆ بەغدا بۆ وتووێژ لەگەڵ سەددام حسێن. ئیدریس بەتەنها چوو بۆ بەغداو سەددامی بینی. پاش ئەوەی کەهاتەوە، وتی سەددام حسێن ئامادە نەبووە هیچ مافێکی کورد بسەلمێنێ.

هێنرانە ناوچەکانی شۆڕش.

ئەوەی زۆرتر بیروباوەڕو وورەی خەڵکی بەرز کردەوە، قسەر گوتارەکانی هەندێ لەکاربەدەستە بەرزەکانی شۆڕشە. بۆ نمونە، لەکۆبونەوەیەکی جەماوەری لەناوپردان، کاربەدەستێکی بەرزی شۆڕش لەوەڵامی پرسیارێکدا گوتبوی "حکومەت بەچی لەئێمە بدات، ئێمەش هەمان چەکی لەگەڵ بەکار دێنین". ئەم جۆرە هەڕەشانە تینێکی زۆریان دایە بەرزکردنەوەی وورەی خەڵكو پێشمەرگە.

لەوەش ئەولاترو گرنگتر، ئێزگەو ئاژانسەکانی بێگانەو دەرەوە کەوتنە ئاشکراکردنی هەندێ شت کە بەجارێ وورەی خەڵکی کوردستانیان بەرز کردەوەو وورەی سوپای حکومەتیان دابەزاند. لەمانگی ئازاری ١٩٧٤دا رادیۆی ئیسرائیل هەواڵێکی دەرخست کە لەئاژانسی دەنگوباسی تورکیا وەری گرتبو گوایە "حکومەتی ئەمریکا ژمارەیەك فڕۆکەی جەنگیی بەشۆڕشگێڕانی کورد داوەو کوردەکان بەدزییەوە مەشقیان لەسەر ئەو فڕۆکانە کردووەو ئێستا ئەو فڕۆکانە لەهەندێ لەفڕۆکەخانەکانی ئێران نیشتونەتەوەو کوردەکان لەماوەی ئەم مانگەدا فڕۆکەکان وەردەگرن".

دەیان بەڵگەی تر ئاشکرای دەکەن کەشەڕی ئەمجارەی کوردستان خوێناویو مەزنو فراوان دەبێتو دەستی بێگانە دەکەوێتە ناو ئەم شەڕەو لەچوارچێوەی شەڕی ناوخۆیی دەری دێنێ.

ئەوەی زۆرتر نیشانی دەدا کەشۆڕش بەهێزەو دەستێکی کارا دەوەشێنێتو ئەوەی کەباشتر بۆ خەڵکی رون کردەوە کەشەڕەکە چوارچێوەیەکی تر وەردەگرێ ئەوەیە کەحکومەتی بەعس کەوتە کێشانەوەی سوپا لەهەندێ شوێن کە بەگرنگ دەژمێردران وەك ناوچەکانی رەواندزو رانیەو کۆیەو چیای پیرسو سلێمانیو دهۆكو شوێنی ترو سەربازگەکان بەشێوەیەکی تایبەت بۆ خۆشاردنەوەو غەشو داپۆشینی

چادر بەسەر ترومبێل‌و تانك‌و شتی تر بەكار هێنران. ئەمە پیشانی دەدا كەحكومەت لەدۆخی بەرگری دەبێ نەك هێرش[1]. هەر تانكێك خەندەكێكی بۆ كراو سەربازگەكان بەتۆپی فڕۆكەشكێن دەپارێزران‌و دژە تانك بەسەر سەربازەكاندا دابەش دەكرا.

ئەم وەزعە وای لەخەڵكی كرد توشی هەمان ئەو بەهەڵەداچونە ببنەوە كە لەسەرەتای هەڵایسانی شۆڕش توشی هاتبون[2] چونكە ئەو كاتە وایان دەزانی شەڕ لەچەند هەفتەیەك زیاتر دەوام ناكات‌و هێزەكانی حكومەت لەحەمرین ئاوای ئەودیو دەكرێن.

لەسەر ئەم بناغەیە، تەقدیرانی عەسكەریی نادروست بۆ هەڵوێست‌و شەڕ كراو لەخۆباییی بون‌و سەرگەرمی بەسەر خەڵكیدا زاڵ بوو. بۆیە كاروباری بەرگری لاواز بوو و شەپۆلێكی گەورەی خەڵك روی كردە ناوچەی ئازادكراو كەبوە هۆی دواخستن‌و لاوازكردنی زۆربەی كاروباری بەرگری. هەروەها وای كرد هەموو بنكەو بارەگاكانی پارتی‌و شۆڕش سەرقاڵ بن بەدامەزراندنی خەڵك‌و دابەشكردنیان بەسەر كاروبارو بنكەكاندا. خەڵك بەجارێ چەكی هەڵگرت‌و هاتە ریزی شۆڕشەوە.

هەرچەند زۆریی ژمارە بۆ ورە باشە بەڵام لەبەر بێ تەجروبەیی‌و بێ تەدریب‌و رانەهاتنی خەڵك لەسەر وەزعی تازەو شەڕ نەدیتنیان‌و نەشارەزاییان لەشەڕو هونەری شەڕ، ئەو لەشكرە نەشارەزاو لەسەر شەڕ

---

[1] لەڕاستیدا ئەم پێشبینییە راست دەرنەچوو. وەك پاش دەستپێكردنەوەی شەڕ دەركەوت، شۆڕش هیچ ستراتیجێكی هێرشبەرانەی نەبوەو زۆرتر ستراتیجی بەرگریی گرتبوە بەر، لەكاتێكدا سوپای عیراق بە بەردەوامی لەدۆخی هێرشدا بووە و بەدرێژایی ماوەی شەڕ بەردەوام بوو لەسەر گرتنەوەی ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش‌و لەكۆتاییدا كەوتە هەڕەشەكردن لەناوچەی حاجی ئۆمەران كەبارەگای بارزانیی لێ بوو.

[2] مەبەست سەرەتای هەڵایسانی شۆڕشی ئەیلولە لەساڵی ١٩٦١ كەخەڵك وا تێگەیشتبوون شۆڕشەكە تەنها چەند هەفتەیەك دەخایەنێ، وەك نوسەر دەڵێ.

رانەهاتووە بووە بارگرانی لەسەر پێشمەرگەی کۆن و وورەی ئەوانیشی شکاند.

سەنگەر بەرامبەر یەکتر وەستاو شەڕ دەستی پێکردو حکومەت مۆڵەتی پازدە ڕۆژی بەسەرکردایەتیی شۆڕش و پارتی دا کە سەر دانەوێنێ ئەگینا بەزۆر پێیان دەسەلمێنێ.

بەجۆرە، ئەو هەڕەشەو پڕۆپاگەندەیەی هەبوو کەگوایە حکومەت بەفڕۆکە پەلاماری فراوانی ناوچەکان دەدا، تا ڕۆژی ٢٦ی ئازار دواکەوت. ئەمەش بۆ خەڵك دەرفەتێکی باش بوو تا بۆ خۆی چاڵ و پەناگە دروست بکا.

لەسەرەتادا پێشمەرگە پەلاماری سەربازگەو سەنگەرەکانی حکومەتی داو بەباوەڕێکی توندو وورەیەکی بەرز چونە پێش بەبێ ئەوەی حیسابێکی هوردو دروست بۆ هێزی دوژمن بکرێت کەئەمەش لەڕوی تاکتیکییەوە هەڵەیەکی عەسکەرییەو ئەنجامیشی سەرنەکەوتنە. بەو بۆچونە نادروستەو بەو پلانە عەسکەرییە سادەیە چونە سەر دوژمن. حکومەت لەدۆخی بەرگریدا بوو. زۆر سەربازگەو شوێنی سوپایی گەمارۆ دران و ڕێگای هاتوچۆیان لێ بەسترا بۆ ئەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن.

لێرەدا پێویستە لەڕوی عەسکەرییەوە ئەم ڕاستییە ڕون بکەمەوە کەشۆڕشی ئێمە لەڕوی عەسکەرییەوە لەگەڵ چەرخ و ڕۆژگاری عەسکەری نەڕۆیشتووەو لەسەر شێوەی کۆن کەوتۆتە شەڕ. بۆیە لەڕوی چەکەوە حیسابێکی هوردی بۆ ستراتیجی دوژمن نەکرد. سەرکردایەتیی شۆڕش زۆر باش دەیزانی کەڕوس هەزارەها تانك و زرێپۆشی بە بەعس داوە، سەرباری دەیان فڕۆکەی جەنگیی تازە[1].

---

[1] ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی پێیان باش بوو هانا بۆ شەڕ نەبرێ و لەو بڕوایەدا بوون کەهێشتا دەرفەت بۆ گەیشتن بەڕێککەوتن هەیە بەڵام مەلا مستەفا لەگەڵ

شۆڕش بەپێی توانا دژە ئاسمانیی پەیدا کردو زۆر جۆرە تۆپی بۆ بەرگری دژی پەلاماری ئاسمانی دامەزراند وەك تۆپی سێ لولەو دۆشکەو تۆپی ٢٠ملمو تۆپی ٣٠ملم. ڕاستە سەرکردە سوپاییەکانمان حیسابیان بۆ فڕۆکە کرد، بەڵام خەتایەکی عەسکەریی گەورەیان کرد کەهیچ حیسابێکیان بۆ تانك نەکرد. بەهەمان چاوی پێشوو سەیریان کرد کەپیادە دەوری بەرو دوای لەپەلاماردانداا دەبێتو هیچ جۆرە چەکێکی وایان مسۆگەر نەکرد کەتانکی پێ بشکێنن بەڵکو هەر پشتیان بەکۆنە چەکەکانی وەك قازیفەی ساروخو ئارپیچی بەستبوو. هەڵبەت ئەم چەکانەش کەم کاریگەرن بۆ شەڕ چونکە دور نارۆنو لەدۆخی هێرشی فراوانی تانکەکاندا نایەنە بەکارهێنان چونکە پێشمەرگە لەیەك گوللە زیاتر ناتوانێ تێی بگرێ، ئەویش خۆیو بەختی، چونکە تانکێکی تر کەپاڵپشتێتی هێرش دەباتە سەر سەرچاوەی تۆپەکە. لەئەنجامی ئەم خەتا عەسکەرییەدا توشی زۆر زیانو شکست هاتینو دوژمن بەجۆرێکی زۆر فراوان تانكو ئالیاتی بەکار هێناو پشتی بەپیادە نەبەست.

بۆ نمونە، لەهێرشەکەی سوپا بۆ سەر هێزۆپو سەفینو دۆڵی ئەسحابان لەهەر یەکێ لەو بەرانەی شەڕ دوژمن ٥٠ تا ١٥٠ تانکی بەکار هێنا. لەجیاتی ڕەبیەی جێگیر کەجاران دروستی دەکرد بۆ بەرگری کردن لەو شوێنەی وەدەستی هێناوە، ڕەبیەی جوڵاو دروست دەکاو چوار پێنج تانك بەچەشنی بازنە سەر دەکەنە سەر یەکتریو پیادەکان بەبێ ترس تێیدا دەحەوێنەوە.

جاران پێشمەرگە هێرشی دەکردە سەر ڕەبیە جێگیرەکان بەڵام ئەمجارە

---

دەستپێکردنەوەی شەڕدا بوو. ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتیی پارتی کە لەگەڵ ڕێککەوتندا بوون، ژمارەیان زۆر بوو لەوانە سامی عەبدولڕەحمان، دارا تۆفیق، دکتۆر مەحمود عوسمان، حەبیب محەمەد کەریم، ساڵح یوسفی، عەلی عەبدوڵڵاو زۆری تر .

بەپێچەوانەوە ڕەبیە پەلاماری پێشمەرگە دەداو ڕاوی دەنێ.

ئینجا با بێمەوە سەر باس کردنی باری دەرونیی خەڵك لەماوەی ڕۆژانی دوای ئازار. خەڵك بەجارێ لەناو شەپۆلی خوێن گەرمیدا مەلەی دەکردو لەو باوەڕەدا بون کەئەمجارە پێشمەرگە بەماوەیەکی کەم سوپای حکومەت دەخوات‌و قوتی دەدات‌و ڕایدەماڵێ. ئەگەر بەناو خەلکدا ڕەت ببوویتایە، بۆ نمونە لەبازاڕی چۆمان، لەوە زیاترت نەدەدیت‌و نەدەبیست کە "چەند ڕۆژێکی تر هێرش دەکەینە سەر هەولێرو سەربازگەو ڕەبیەکانی حکومەت لەهەولێر لەسەدا سەد بەبێ کوشتار خۆیان بەدەستەوە دەدەن‌و زۆر ناخایەنێ هەولێریش دەسەلاتی حکومەتی لەسەر لادەکەوێ‌و حکومەت لەخۆی ڕانابینێ بەرەنگاری پێشمەرگە ببێتەوە".

ئەمە لەزەوی. لەئاسمانیش، خەڵك لەو باوەڕەدا بون مومکین نیە جارێکی تر فڕۆکەی دوژمن بتوانێ بێتە سەر ناوچەکانی شۆڕش‌و ئەگەر هات‌و هێرشی فراوانیشی کرد، ئەوا لەسەدا هەشتای فڕۆکەکان ناگەڕێنەوە. ئیتر هەر ئەوە گرنگە کە لەیەکەم پەلاماردا خۆمان بپارێزن‌و بەس.

ئینجا با بێمە سەر گۆڕانی هەڵوێست لەخوێن گەرمی‌و ورە بەرزییەوە بۆ ئەوپەڕی ساردبونەوەو ورە بەردان.

بەیاننامە کرچ‌و کاڵەکەی ئۆتۆنۆمی لەلایەن حکومەتەوە بڵاو کرایەوە، ئینجا هەڕەشەو جەنگی سارد دەستی پێکرد. حکومەت کەوتە هەڕەشەی ئەوەی کەئەم ئۆتۆنۆمییە بەسەر کورددا دەسەپێنێت‌و هەر کەسێك ڕازی نەبێ سەری پان دەکاتەوە. حکومەت بەئاشکرا وتی ئەوانەی یاخی بون‌و دەیانەوێ کۆسپ بخەنە سەر ڕێگای ئەم پرۆژەیە، بەئاگرو ئاسن لەناویان دەبات. شەڕ دەستی پێکردو سوپای حکومەت کەوتە جوڵانەوەو شەڕی خوێناوی بەرپا بوو. لەیەکەم کردەوەدا حکومەت هەولێدا گەمارۆی سەر

سەربازگەکان بشکێنێتو رێگای ئازوقەو چەكو تفاقیان بۆ مسۆگەر بکات. تانکەکان کۆمەڵ کۆمەڵ کەوتنە پێش، رویان کردە ئەو شوێنانەی پێشمەرگەی لێیەو بەهێزی ئاگرو ئاسن بەرەی پێشمەرگەریان لەت کرد. گولله چی لەگەڵ تانك دەکات؟

سوپا لەسەرخۆو بەبێ ئالۆزی بەرەو ئامانجەکانی پێشڕەوی کرد. لەکەرکوکەوە بەرەو تەقتەقو لەتەقتەقەوە بەرەو کۆیە کەوتە رێ. بەزۆرەملێ رێگای بۆ خۆی کردەوەو پەیوەندیی لەگەڵ هێزە گەمارۆدراوەکان بەست. لەهەولێریشەوە بەرەو سەلاحەددین کەوتە رێو دواتر لایدا بەرەو دەربەندی کۆرێو دوای چەند هێرشێکی توند بەپشتیوانیی فڕۆکەو پاش چەند رۆژێك توانی گەمارۆکە بشکێنێو لەگەڵ سەربازگەی سەرمەیدانی شەقلاوە یەك بگرێتەوە، ئینجا لەوێوە وەرچەرخایە سەر سپیلكو بەشەڕو ئاگر خۆی گەیاندە ئەوێ. لەهەمان کاتیشدا لەکەرکوكو سلێمانییەوە کەوتە رێ بۆ پاککردنەوەی رێگای گشتیی نێوان هەردوو شار.

لەبەرەی بادینانیش دەیان تانك وەك مێروله بەرەو دهۆكو زاخۆ کەوتنە رێو لەگەڵ سەربازگەی لیوای ١٨ لەدهۆك یەکیان گرتەوە. ئینجا هێزێکی تر لەموسڵەوە بەدەشتدا لەدیجلە پەڕییەوەو روی کردە دەشتی سلیڤانیو بەبێ شەڕێکی ئەوتۆ گەلی زاخۆی داگیر کردو فەوجە گەمارۆدراوەکەی زاخۆشی رزگار کرد.

هەڵبەت ئەو هێرشانە بەپشتیوانیی فڕۆکە ئەنجام دراونو دەیان فڕۆکە بەئاسماندا دەفڕینو ئاگرو ئاسنیان دەباراند نەك هەر بەسەر بەرەی شەڕ بەڵکو بەسەر ناوچە مەدەنییەکانیش.

کاتێك خەڵك ئەمەی دیت، یەکسەر وەك ئەوەی ئاوێك بەئاگردا بکەوێ سارد بونەوەو کەوتنە خۆ قایم کردن، بەتایبەتی کەهێشتا سەرماو سۆڵەو

زوقم‌و بەفر لەگۆڕێدا بون‌و باران هەر دەباری. خەڵك كەوتە خۆی‌و دەستی بەدروست كردنی حەشارگەو كونە تەیارە كرد. مەترسیی فڕۆكە زۆر بوو، تەنانەت مەترسیی فڕێدانی گازیش هەبوو. خەڵك لەبەر باران‌و سەرما لەدەرەوە نەدەحەوانەوە. خەلكی شارو دێهات‌و ئاوەدانییەكانیش ناچار بون هەلكشێن بۆ ئەشكەفت‌و بن بەردو شوێنی تر. زۆربەشیان دەستیان بەهەلكەندنی كونە تەیارە كرد بەڵام باران كونە تەیارەكانی دەتەپاندو ماندوبونیانی بەبا دەبرد.

تەنگاوی پەیدا بوو. زەغت كەوتە سەر شۆڕش بۆ چارەكردنی ئەو خەلكەو رزگاركردنیان لەو مەترسییە. بەڕاستی ئەگەر فڕۆكەكان بەدروستی لەئاوایی‌و شارەكانیان بدایە دەبوە كارەسات، بەڵام لەڕاستیدا فڕۆكەكان لەدێهات‌و شارەكانیان نەدەدا. سەدەها بۆمبای زل لەشوێنی چۆڵ‌و شاخاوی دەدرا، تەنانەت كە لەشارەكانی قەڵادزێ‌و رانیەو هەڵەبجەش دراوە، لێدانەكە لەئەنجامی دامەزراندنی هەندێ دام‌و دەزگای گشتی بووەو دوژمن نیازی بوو خەلكی ئەو شوێنانە دەمكوت بكاو بیانتۆقێنێ.

لە٢٤ی نیسانی ١٩٧٤دا دوو فڕۆكەی سیخۆی ٧ پەلاماری شارە هێمن‌و خۆشەكەی قەڵادزێیان داو مردنیان بەسەر شارەكەدا داباراند. لەو هێرشە نامرۆڤانەیەدا ١٣٤ كەس كوژران‌و ٥١ كەس بریندار بون‌و دەیان خانوو و دوكان‌و چایخانە وێران كران.

دوای دوو رۆژ لەو كارەساتە، لە ٢٦ی نیساندا فڕۆكە پەلاماری شاری هەڵەبجەی داو نزیكەی ٣٨ كەس كوژران‌و بریندار كران. ئەم كارەساتە دڕندانەیە شۆڕشیان ناچار كرد دەرگای ئێران بۆ ئەو خەلكە بكاتەوەو راشیان لەدەوڵەتی ئێران كرد بەیارمەتیی دەزگای شێرو خورشیدی ئێران[1]

---

[1] دەزگای شێرو خورشیدی سوری ئێران دەزگایەكی مرۆڤدۆستە، لەساڵی ١٩٢٩ دامەزراوە، ئەویش وەك یەكێ لەناونیشانە فەرمییەكانی رێكخراوی خاچی سوری

چادرو هۆیەکانی ژیانیان بۆ مسۆگەر بکات.

من مالّم لەئازادی[1] لەسەر جادە بوو. بەوردی سەیری وەزعم دەکردو بەهۆی ئەوەی کە بەڕادیۆ زۆر بروسکەی شەڕم وەردەگرت، باش ئاگاداری وەزعەکە بوم. منیش وەکو خەلکی تر، بۆ سەلامەتیی خێزانم کونە تەیارەیەکم لەناو باخی عەبدولقادری کوڕی شێخ عەلادین هەلکەندو سەرم گرت. هەندێ گەنج لەئاوایی خەلان[2] زیارەی[3] من بون‌و بەجۆرێکی باش حەشارگەیەکی مامناوەنجییان بۆ دروست کردم، ئەویش هەر بۆ ئیحتیات، هەرچەند نەچووینە ناویشی.

لەگەلّ مالّی عەبدولقادر دراوسێ بوین‌و حەق‌و حقوقی دراوسێیەتیمان لەسەر یەکتری هەبوو، خۆیشم هەر لەیەکێ لەخانووەکانی ئەودا بووم. مالّ‌و منداڵەکانی زۆر لەفڕۆکە دەترسان‌و خۆیان پێ رادەنەگیرا. ئەوی راستیش بێ، کاك عەبدولقادر خۆیشی لەترسان بێ قسوور بوو. خەلکیش لابەلا پلاریان تێدەگرت. بۆیە تۆزێ کونە فڕۆکەکەم گەورەتر کرد تاکو جێگای خێزانی ئەویشی تێدا ببێتەوە، ئەویش ئەگەر لێمان قەوما.

لەناو ئەم ترس‌و هەلایەدا کتوپڕ کۆمەلێك میوان هاتن، نزیکەی ١٠-١٢ کەس دەبون. زۆربەیان ژن‌و منداڵ بون. مالّی شێخ محەمەدی عەوێنە بون کەشێخ خۆیشی تەشریفی هێنا بوو. پیرەمێردێکی بەتەمەن‌و

---

نێودەولەتی‌و ڕێکخراوی مانگی سوری نێودەولەتی. ئەم ڕێکخراوە ڕۆلێکی بالای لەفریاکەوتنی ئاوارەو لێقەوماوانی کوردی عیراق بینی‌و زۆر خزمەتی کردن. لەسالّی ١٩٨٠دا کۆماری ئیسلامیی ئێران ناوی ڕێکخراوەکەی گۆڕی‌و کردی بەڕێکخراوی مانگی سوری ئێران.

[1] ئازادی گوندێکە لەناحیەی حاجی ئۆمەرانی سەر بەقەزای چۆمان لەپارێزگای هەولێر.

[2] خەلان گوندێکە لەناحیەی حاجی ئۆمەرانی سەر بەقەزای چۆمان. زیندانێکی گەورەی لێ دروست کرابوو.

[3] زیارە: هاوکار، هەرەوەز، کاری بەکۆمەلّ بۆ یارمەتیدانی یەکتر.

پەککەوتوو بوو، دەبوایە دەستی بگرن. کاک عەبدولقادر بۆرە خزمایەتییەکی لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە هەبوو، بۆیە لەخانوی خۆی جێگای بۆ کردنەوە. دەبێ لەکاتی تەنگانەدا حیساب بۆ ئەوانیش بکرێت، بۆیە ناچار بوم کونە تەیارەکەی خۆمم پێشکەش بەکاك عەبدولقادرو میوانەکانی کرد، بۆ خۆیشم یەکێکی ترم هەڵکەند. هەڵبەت لەکاتی ترس و تەنگاویی وادا، بەخشینی کونە تەیارە پیاوەتییە. بەڵام بەیانی کاتێك کەچوومە سەر کونە تەیارەکە، سەیرم کرد باران تەپاندویەتی. ناچار بوم سەرلەنوێ بەخۆم و چوار زەلام تا ئێوارە هەر خەریکی دروست کردنی کونە تەیارە بین تا تەواومان کرد.

لەو ماوەیەدا حکومەت ئینزارێکی ۱۵ رۆژیی دابوو بۆ شۆڕش تا سەر بچەمێنێت بۆ پڕۆژە کرچ و کاڵەکەی ئۆتۆنۆمی. لەبەر ئەوە ناچار بووم لەئێوارەی ۲۵ی ئازار کەدوایین رۆژی کۆتایی هاتنی ئینزارەکەیە، دەست بکەم بەدروست کردنی کونە تەیارەیەك. شوێنێکی باشم پەیدا کرد کەکاولە خانوو بوو. دیوارەکەم رماندو بەگوێرەی پێویست تا نزیك خۆرئاوابون لەبەر رێژنەی باران کارم کرد. بەڵام دیوارەکە تەواو نەبوو. بەیانی، لەگەڵ بانگی کەڵەشێر هەڵسامەوەو لەگەڵ عومەر خەلانەیی کە لەلام بوو، تا خۆر گەرم بوو دیوارەکەمان تەواو کرد. گەڕام بەشوێن هەندێ کاریتە بۆ دارەڕاکردنی. نیوەڕۆ ئەویشمان تەواوکرد و خۆڵەبانیشم کرد. ئینجا بەگیاو دارو دەوەن شاردمەوە.

مانگی ئازار کۆتایی هات، هێشتا ئاسمانی ناوچەی باڵەك هەر خاوێن و هێمن بوو بەڵام ئیحتیات بەباشی وەرگیابوو، پەیڕەوی "بەرگریی شارستانی" بلاو کرابۆوەو خەڵك خۆی تقەت کردبوو، ترومبێلیان لەقوڕ گرتبوو و تەنها کونێك لەبەردەم شوفێر هێڵدرابۆوەو ئەوی تر هەموو داخرا بوو. لایتی ترومبێلەکان بەرەنگی شین سواغ درا بوون. دەورو پشتی قەسرو

ماکۆس، دیلمان، گەلاڵە، ناوپردان، چۆمان و بارەگای نێزگەو زۆر شوێنی تر بەتۆپی فڕۆکەشکێن پەرژین کرابون.

مانگی ئازار تەواو بوو. هەرچەند حکومەت لە ٢٥ی ئازار بەیاننامەی لێبوردنی بۆ ئەوانە دەرکردبوو کەرادیۆی بەغدا بەهەڵخەڵەتاو ناوی بردبوون، بەلام فڕۆکە مردن هاوێژەکان لەبەرەکانی شەڕەوە هاتنە سەر ناوچەو شوێنە شارستانییەکان. ئەگەرچی لەرەواندز بەولاوە نەهاتن، بەلام ترس و هەڕەشە پێش هێرشی فڕۆکە دزەی کردبوە ناو دڵ و دەرونی خەلکەکە.

ئەوەی پێویستە بیلێم ئەوەیە کەکاربەدەستانمان پێش خەلکەکە تۆقی بوون و لەترسان رەنگیان سپی هەلگەڕا بوو، بۆیە کەوتبونە پاراستن و رزگارکردنی خاوو خێزانەکانیان، بەتایبەتی دوای بۆمباران کردنی شاری قەلادزێی شەهید و هەڵەبجەی بریندار.

پێشتر باسم کردبوو کە ڕێگای ئێران کراوەتەوەو لەژێر سێبەری لیژنەیەکی هاوبەشدا خەڵك بەترومبێل هەلکشایە سەر سنورو ئاوای ئەودیو بون. هەڵبەت بەر لەهەموو کەسێك خێزانی کاربەدەستانمان چونکە خێزانی ئەوان ناسکتر و لەقوڕێکی تایبەتن.

لەئێران سێ جۆرە جێگا بەگوێرەی گەورەیی و بچوکی و خاترو بێ خاتری تەرخان کران. جێگای پلە یەك بۆ ماڵە گەورەکان. پلە دوو بۆ ئەو کاربەدەست و ئەو دەوڵەمەندانەی کەدەتوانن بەئارەزوی خۆیان خانوی خۆش لەشاری خۆش بەکرێ بگرن و تێیدا دابمەزرێن. پلەی سێهەم خێزانی پێشمەرگەو باقی میللەتە کەکامپی تایبەتیان لەچۆلەوانی بۆ کرایەوەو هەر خێزانێك چادرێکی پێ دراو بەسەربازو ژاندرمەری دەورە دران. خواردن‌و خواردنەوەیان بەگوێرەی نفوسیان لەسەر حیسابی دەولەتی میواندار بوو.

ئەم دۆخە لەڕوی ورە بەرزییەوە کارەساتێکی گەورە بوو بۆ شۆڕش. خەڵك لەبەر ڕاکردن بۆ دامەزراندنی خێزان ئەرك و شەرگەی لەبیر چۆوە. پێشمەرگە کە لەدواوەی بەرە ئاوڕی لەدێهات و شارەکان دەدایەوە، تەنها گوێیان لەدەنگی کونەپەپوو و تەیرو تاش دەبوو، کەسەیری ماڵ و کۆلانەکانیان دەکرد تەنها سەگ و پشیلەیان دەبینی و کەسەیری خۆیشیان دەکرد خۆیان بەبێ لێپرسراو و فەرمانڕەوا دەدەیتەوە چونکە لێپرسراوەکەیان چۆتە ئێران خێزانی دامەزرێنێ. بەجۆرە، پێشمەرگەی ئازاو دلێرو پۆلایین، وەك قەلاو لەحیم لەژێر گەرمیی ئاگری دەرونی نائومێدی دەتوایەوەو دەستی تفەنگی نەدەگرت‌و شەڕی بۆ نەدەکرا. سەرباری ئەوەی کەپێشمەرگەکان هەر لەبەر خۆیان دەگوت و دەگوتەوە "ها هوو، ئێمە لەکوێ و ئەوەی ئەم خەلکە هەولی بۆ دەدا لەکوێ".

لێرەدا پێویستە بەدور چاوی پڕ فرمێسك سەیرێکی ئەو خەلکە هەژارو بێدەسەلات و لیقەوماوە بکەین‌و لەدەرون‌و هەناوی پڕ جۆشیان ورد بینەوە، ئەو خەلکەی کە لەشارو دێهاتەکانیان‌و لەخانوبەرەی ئاوەدان‌و لەماڵ‌و هێلانەکانیان توشی دەردەسەری‌و ئازاری ئاوارەیی بون‌و لافاوی فرمێسکی چاوەکانیان لەولاتی بێگانە ڕێچکە دەبەستێ‌و کەوتونەتە ژێر دەست‌و چەپۆکێکی نەدیتەو لێنەڕاهاتوو.

ڕاستە لەڕوی نەتەوەییەوە خۆ هەموی هەر یەك خاکەو چ لەم دیو بێ چ لەو دیو بێ هەر کوردستانە، بەلام ئەو هێڵە نادیارەی[1] کە لەشوورەیەکی بەرزی کۆنکرێت سەختترە، وەك چەقۆیەکی تیژ دڵ‌و دەرونی ئاوارەکان دەبڕێ‌و پەردەیەکی ئەستور دەخاتە بەر چاوی ئەو خەلکە هەژارەو وایان لێدەکا ئاسۆی خاکەکەشیان بەنادیاری ببینن. خۆ ئەگەر مرۆڤ

---

[1] مەبەست لەهێڵە نادیارەکە، سنوری نێوان عیراق‌و ئێرانە کە لەڕوی نێودەوڵەتییەوە کوردی عیراق‌و ئێران لێك دادەبڕێت.

لەئاوایيەكەوە بۆ ئاوایيەكی تری هەمان ناوچەش بار بكات، هەر هەست بەئازاری ئاوارەیی دەكات، چ جای لەسەر خانوبەرەی دامەزراوو لەژیانی ئاسودەوە بچێتە ژێر چەپۆكی رژێمێكی بێگانەو لەكامپی چادرو كۆمەڵ كۆمەڵ بژیت. بەڕاستی ئەمە دەردو ئازارێكی سەختو نائارام دەبێت.

چار نیە. بەخۆشی بێ یان بەناخۆشی، هەر دەبێ بار بكەنو خۆیان لەئاگرو ئاسنو مردن رزگار بكەنو لەدەست فڕۆكەو ئاگربارانەكانی بەعس بار بكەن.

لیژنەیەكی سەرپەرشتیار دامەزراو كەوتە ناو نوسینی خەڵك. سەدان پسولەی پڕكراوە بەسەر خەڵكەكەدا دابەش كران، تەنها ئیمزاكردنیان مابوو. ئیمزاكردنیش كۆسپێكی سەخت بوو چونكە ئەگەر ئەندامێكی لیژنەكە لەوێ نەبوایە، خەڵكەكە پەكیان دەكەوتو دەبوایە كون بەكون بەدوای ئەندامەكانی لیژنەكەدا بگەڕێن.

ئەندامانی لیژنەكە لەترسی فڕۆكە وەك سەگی پێ سوتاو لەهیچ شوێنێك نەدەحەوانەوە، تاقی بەیانی لەدەربەند بون، دوای نیوەڕوان لەحاجی ئۆمەران، شەو لەئاشی شێخیو كاتێكی تر لەچۆمان. بەو جۆرە هیچ كات لەجێگایەك نەدەحەوانەوە.

ئەگەر ئەمە حاڵی لیژنەیەكی روتو سەڵت بێت، ئەی دەبێ حاڵی ئەو هەزارەها خێزانە چۆن بێت كەوەك تەرەكە بەسەر جادەو رێگاوبانو لەناو دارو دەوەنو لەژێر باو بارانو ترسی فڕۆكەدا بڵاو بونەتەوە؟ هەر كەسێك دەیدیت دەیپرسی: برا گیان نازانی لیژنەكە لەكوێیە؟ وەك باڵندەی گوشتخۆر بەدوای لیژنە گەڕۆكەكەدا دەگەڕان و ئەگەر لەشوێنێك لیژنەكەیان بدۆزییایەتەوە وەك شەكرو هەنگ لەلیژنەكە دەوروكانو دەوریان دەداو لێی كۆ دەبونەوە. دەتدیت ئەندامانی لیژنەكە یەكسەر وەك نەقیزەیەكیان لێ بدرێ، هەڵدەستانو دەردەپەڕین. یەكێكیان قسەیەكی

بەگوێی ناسیاوێکی دەچرپاندو خۆی دەهاوێشتە ناو ترومبێل و لەگەڵ ئەندامانی تری لیژنەکە وەك مشکی لەدەست پشیلە راکردوو دەردەپەڕی و لەناو دارو دەوەن لەبەر چاوی خەڵکەکە گوم دەبون. خەڵکەکەش وەك منداڵ و نوقڵ دادەوەرانە سەر ئەو کەسەی کەئەندامێکی لیژنەکە قسەیەکی بەگوێدا چرپاندبوو. کاکە بۆ خاتری خوا بۆ کوێ چوون؟ ئەویش خۆی و ویژدانی، پەنجەی بۆ شوێنێك درێژ دەکردو قسەیەکی دەکرد.

ئیتر هەر ئەوەندەت دەدیت، خەڵکەکە چ بەپیا چ بەترومبێل، روو دەکاتە شوێنەکەو بەدەم رێوە جنێوو نەفرەتیان بۆ لیژنەکە دەنارد.

من لەئازادی بوم و سەیتەرە (بازگە) لەبەردەمی ماڵم بوو. لەسەر جادەی کەدەڕوات بۆ حاجی ئۆمەران، زنجیرەی ترومبێل نەدەپسایەوە. هەر ماڵێك مێژوی پسوڵەکەی لەگەڵ رۆژەکەدا بگونجایە، رێی پێ دەدرا بڕوا بۆ ئێران و ئەگەر مێژووەکە یەك نەبوایە، لێپرسراوی سەیتەرەکە بەڕوویدا- دەتەقییەوەو هاواری دەکرد" بڕۆ دواوە، قەدەغەیە، رۆژی تۆ نەهاتوە".

بەجۆرە دەتدیت دەیان ترومبێلی پڕ خاوو خێزان و منداڵ و بێشکەو ژن و پیر یەك لەدوای یەك زنجیرەیان دەبەست و لەدواوەی داری سەیتەرە لایان دەداو چاوی ترسیشیان هەر بەئاسمانەوە بوو.

سەیتەرەکە پڕ دەبوو لەخاترو خاترخوازی و هاوارو پاڕانەوەی ژن و منداڵ. "بیکە بەخاتری خودا، رامان مەگرن، فڕۆکە هات"، "بیکەنە خاتری خودا، رەحمێکمان پێ بکەن و دەربازمان کەن". لەلایەکی تریشەوە دەبوە قالەو قرە لەنێوان سەیتەرەو هەندێ پێشمەرگە کەشتێکیان لەخۆ ڕا دەدیت و خاترێکیان لەلای یەکێ لەکاربەدەستان هەبوو. لەوێ دەنگ بەرز دەکرایەوەو دەبێ و نابێ و من عایدی فلانە کەسم، بەفەرمانی فلانە کەس هاتوم، من لێپرسراوی فلانە شتم و هتد. ئیتر وایان لێ دەهات کیسەی پارەیان لەبەردەمی لێپرسراو هەڵدەڕشت، ئەویش ئەگەر بیویستایە ئیزنی

ده‌دا یان رایده‌کرده دایه‌ره‌ی ته‌له‌فۆن، خاوه‌نی پسوله‌کانیش وه‌ك مێش به‌دواوه‌یه‌وه ده‌چون‌و به‌ر ده‌رگای دایه‌ره‌که‌یان تاریك ده‌کرد. زۆری نه‌ده‌برد، دوای به‌لێ به‌لێ، لێپرسراوه‌که ده‌هاته ده‌رێ‌و رێی ده‌دا برۆن یان پێی ده‌گوتن "کاکه نابێ".

ناچار خێزانه‌کان داده‌به‌زین‌و به‌م لاو به‌و لای جاده‌که‌دا بلاو ده‌بونه‌وه. له‌ژێر سێبه‌رو له‌په‌نا دارو به‌رد ترومبیله‌کانیان داده‌نا، تا خودا ره‌حم ده‌کاو دلی لێپرسراو نه‌رم ده‌بێت یان فه‌رمانی بۆ دێت که‌رێیان بدا برۆن.

هه‌ندێ رۆژ هه‌ر له‌به‌یانییه‌وه تا ئێواره ئه‌و خێزان‌و مندالآنه له‌به‌ر باو له‌سه‌ر چه‌قی رێگا ده‌که‌وتن. ده‌یان مندالی ساوا ده‌یانویقاندو ده‌یان مندال له‌برسان‌و له‌به‌ر تینوێتی ده‌یاننالآند، دایه دایه‌یان بوو، مه‌گه‌ر مالێك دلی نه‌رم ببوایه‌و خێزانه‌که‌ی به‌مندالّه‌کانه‌وه ببردایه‌ته ژوورێ‌و خواردنیان بدایه‌تێ. هه‌ندێ جاریش هه‌ندێ خێزان تا چه‌ند شه‌وو رۆژێك له‌بن دیوارو سه‌ر رێگا ده‌مانه‌وه.

خاوه‌نی ترومبێله‌کان‌و شوفێره‌کان قۆلی بێ به‌زه‌ییان لێ هه‌لمالی بوو و بێ ویژدانانه که‌وتبونه رنینه‌وه‌ی ئه‌و خه‌لکه هه‌ژاره. مالیان له‌چۆمانه‌وه به ٢٣ دینار ده‌برده خانه. له‌به‌ر خراپیی وه‌زع‌و ترسیش، خه‌لك چاوی له‌پاره نه‌بوو. ناچار بون له‌ژێر ترس و ره‌حمی فرۆکه‌و بۆمباران بن یان ده‌بێ ئه‌و باجه زۆره بده‌ن، بێ ئه‌وه‌ی که‌س سنورێك بۆ ئه‌و شوفێرانه دابنێت. زۆر خێزان له‌به‌ر بێ پاره‌یی له‌سه‌ر چه‌قی رێگا فرێ ده‌دران. سه‌ره‌رای ئه‌و هه‌موو ژماره زۆره‌ی ترومبێل، که‌چی ترومبێل ده‌ست نه‌ده‌که‌وت چونکه کرێ ئه‌وه‌نده گران بوو، له‌سنوری ویژدان‌و شه‌ره‌ف چوو بووه ده‌ره‌وه.

له‌دوا دواییدا شۆرش بیری له‌و کاره‌ساته کرده‌وه. نرخی کرێ دیاری کراو شوفێرو خاوه‌ن ترومبیله‌کان ده‌مکوت کران به‌لآم ئه‌وانه زۆربه‌ی ترومبێله‌کانیان شارده‌وه‌و کاریان نه‌کرد به‌لآم به‌دزییه‌وه بازاری ره‌شی مال

گواستنەوە هەر کاری دەکرد.

لەو ماوەیەدا زۆر شوفێر ٢-٣ هەزار دینـاری لەرووتاندنـەوەی خێزانـە لێقەوماوەکان پاشەکەوت کردبوو، جگە لەسەیتەرەی ئـازادی، سـەیتەرەی تریش لەشیوە رەش‌و سـەر سـنور هـەبوو. هەنـدێ جـار ٤٠٠-٥٠٠ مـاڵ لەسەر سنور فرێ دەدرانە بـەر هـەتاو بـەبێ هـیچ پەناگەیـەك، ئـەویش بەبیانوی ئـەوەی کـەرۆژی دیاریکراویـان بـۆ پەڕینـەوە لەسـنور هێشـتا نەهاتووە یان لیژنەکە لەوێ نیەو چۆتە ئەودیو یـان چـادر هـەڵ نـەدراوە. دەتدیت لەو هەراو هۆریایەدا فڕۆکەش پەیدا دەبـوو و بەسـەر ناوچـەکەدا دەسـوڕایەوەو هەنـدێ شـوێنی بۆمبـاران دەکـرد. ئـیتر کـەس کەسـی نەدەناسییەوە، دایك مندالّی ساوای لەبیر دەکـرد، منـداڵ دایکـی لێ بـزر دەبوو و هاوارو گریان دەنگی فڕۆکەی دەشاردەوە. بەڵام شـوکر بـۆ خـودای مەزن هیچ جار لەدەربەند بەرەو ژور فرۆکە بۆمبابارانی نەکردووە.

کاتێك فڕۆکە دەهات، ژاندرمەکانی[1] ئێران بەدارو پاڵەپەستۆو مشـت دەکەوتنە سەر ئەو بەستەزمانانەو بەزۆرەملێ بۆ ئـەودیوی سـنور پاڵیـان پێوە دەنانەوە.

ئـا بـەم حاڵـە خـەڵك ئـازاری دەربـەدەری‌و ئـاوارەیی دەکێشـێت‌و رۆڵەکانیشـیان لەبـەرەی پێشـەوەدا بـەرگری دەکـەن‌و خـاکی پیرۆزمـان لەهێرش‌و پەلاماری دوژمن دەپارێزن.

---

[1] ژاندارمەری هێزێکی سەربازییە هەندێ ئەرکی پۆلیسی پێ دەسپێردرێ‌و بۆ پاراستنی ئاسایش‌و ئارامی لەشوێنە دورەکان‌و لەسەر سنورەکان‌و لەکاتی رووداوەکان‌و لێقەوماندا سودی لێ وەردەگیرێ، بەمەبەستی یارمەتیدانی دەزگا یاساییی‌و فریاگوزارییەکان‌و خزمەت کردنی هاوولاتیان. لەفەرەنسا بەم هێزە دەوترێ GENDARMERIE لەتورکیا بە CENDIRMA و لەنێو کوردی باشور لەزەمانی عوسمانییەکانەوە بەجەندرمە ناسراوە.

# بەشی دووەم

## یاداشتی رۆژانە

لەیاداشتی رۆژانەدا تەنها ئیشارەت بۆ ئەو رۆژانە دەکەم کە شتی گرنگ تێیدا رویداوە، بۆیە زنجیرەکە پچڕ پچڕەو هەموو رۆژێکم نەنوسیوەو لەمانگی شوباتەوە دەستی پێ دەکەم چونکە لەو مانگەدا چالاکیو جموجولێکی زۆر لەئارادا بوو لەڕوی هاتوچۆکردنی وەفدەکانی ئەمسەرو ئەو سەرەوە[1]. لەمانگی کانونی دووەمی ١٩٧٤ گفتوگۆی رەسمی لەنێوان وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستانو حزبی بەعس دەستی پێ کرد. حەبیب فەیلی[2] سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان سەرۆکی وەفدی شۆڕش بوو، لەلایەن بەعسیشەوە سەددام حسێن سەرۆکی وەفد بوو[3]. ماوەیەکی زۆر

---

[1] مەبەست ئەو جموجوڵو چالاکیو رتوویژەیە کە لەمانگی شوباتی ١٩٧٤ زۆر بەگەرمو گوڕی لەئارادا بوو، چونکە ماوەی چوار ساڵی ئاگربڕو ئاشتیی ١٩٧٠- ١٩٧٤ی نێوان شۆڕشو رژێمی بەعس بەرەو کۆتایی دەچوو، لەکاتێکدا هەردوو لایەن هێشتا نەگەیشتبوون بەرێککەوتن. بۆیە جموجوڵێکی زۆر لەئارادا بوو بۆ رێگرتن لەسەرهەڵدانەوەی شەڕ. دیارە ئەو جموجوڵە مەبەستەکانی خۆی نەپێکاو لەسەرەنجامدا شەڕ هەڵگیرسایەوە.

[2] مەبەست لەحەبیب فەیلی، حەبیب محەمەد کەریمە کە ساڵی ١٩٣١ لەزورباتیە لەدایك بووە. دەرچووی ساڵی ١٩٥٩ی کۆلیجی مافە لەزانکۆی بەغدا. ساڵی ١٩٥٦ بۆتە ئەندامی سەرکردایەتیی پارتیو لەماوەی ساڵانی ١٩٦٤- ١٩٧٥ سکرتێری پارتی بووە. لەساڵی ٢٠١٣دا کۆچی دوایی کردووە.

[3] لێرە مەسەلەکە نەختێك وردبینیی پێویستەو لەوانەیە تێکەڵ کردنێکیش هەبێ. لەسەرەتای دەست پێ کردنی پرۆسەی گەیشتن بە بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، سەددام حسێن سەرۆکی شاندی حکومەتی عیراق بوو. دواتریش فایلی کورد هەر لای ئەو بوو. بەڵام

وەفدی کوردی لەبەغدا مایەوەو لەکۆتایی مانگی کانونی دووەمی ١٩٧٤ گەڕایەوە بەبێ ئەوەی هیچ هەنگاوێکی جێی باوەڕ بهاوێژرێت. لەسەرەتای مانگی شوبات وەفدەکە جارێکی تر چۆوە بەغدا. دیسان سەردانەکە خێری نەبوو. ئەوجا پاشان وەفدی حکومەت بەیاوەریی وەزیرەکانی ئێمە لەبەغدا[1] دەهاتن بۆ بەردەوامبون لەسەر گفتوگۆکردن.

هەردوولا پرۆژەی خۆی بەدەستەوە بوو. پرۆژەی بەعس بۆ چۆنیەتیی ئۆتۆنۆمی لەکۆنگرەی هەشتەمی حزبی بەعس بڕیاری لێ درابوو. ئەو پرۆژەیە مافی گەلی کوردی بەتەواوی پێشێل دەکردو زۆر ناوچەو شاری گرنگی لەکوردستان دادەبڕی وەك شاری کەرکوكو خانەقینو مەندەلیو شنگال. حزبی لەڕێ لادەری شیوعییەکانی لیژنەی ناوەندی لەگەڵ وەفدی بەعس یەکڕا بوو بەرامبەر بەپارتی[2]. جگە لەدابڕاندنی زۆر ناوچەی

---

لەساڵی ١٩٧٤ لەسەروبەندی کۆتایی هاتنی ماوەی چوار ساڵی ئاشتی، سەددام حسێن سەرۆکی شاندی حکومەتی عیراق نەبوو بەڵکو بەرپرسی فایلی کورد بوو و وەك سەرۆکی شاند هەڵسوکەوتی لەگەڵ پارتی نەدەکردو لەساڵی ١٩٧٤ سەردانی کوردستانی نەکردووە.

[1] بەگوێرەی ئەوەی کەسەرکردایەتیی شۆڕشو حزبی بەعس لەسەری ڕێککەوتبون، پارتی دیموکراتی کوردستان پێنج وەزیری هەبوو لەبەغدا کە ئەمانەن:

-محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان (سامی) وەزیری کاروباری باکور.

-ئافیز جەلال حەوێزی وەزیری کشتوکاڵ.

-نوری شاوەیس وەزیری نیشتەجێ کردن.

-ئیحسان شێرزاد وەزیری شارەوانییەکان.

-ساڵح یوسفی وەزیری دەوڵەت.

هەروەها سێ پارێزگاریشی هەبوو کە ئەمانەن:

-عەلی عەبدوڵڵا پارێزگاری سلێمانی.

-عەبدولوەهاب ئەتروشی پارێزگاری هەولێر.

-هاشم عەقراوی پارێزگاری دهۆك.

[2] لەو کاتەدا پارتی کۆمۆنیستی عیراق (شیوعی) ئەندامی بەرەی نیشتمانیو نەتەوایەتیی پێشکەوتنخواز بوو کەحزبی بەعس سەرکردایەتیی دەکرد.

کوردستان، پرۆژەکەی حکومەتی عیراق دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندیی بەتەواوی دەسەپاندە سەر هەموو کاروباری حکومەتی ئۆتۆنۆمیو واشی پیشان دەدا کە بەبێ بڕیاری حکومەتی ناوەندی، حکومەتی هەرێم مافی هیچ بڕیارو کردەوەیەکی نیە. سەبارەت بەکێشەی نەوتیش، کورد بەتەواوی لەبەروبومی نەوت بێبەش دەکرێت، مەگەر حکومەتی ناوەندی لەم بارەیەوە بڕیار لەسەر هەندێ شت بدات. بەهەر حاڵ، خاڵی ناکۆك لەپرۆژەی هەردولا زۆر زۆر بوو. حکومەتی بەعس پای لەسەر زەوی چەقاندبوو و لەسەر دار نەدەهاتە خوارەوەو دەرفەتی وتووێژی سیاسیی بەگفتوگۆکردن نەدەداو سور بوو لەسەر بڕیاری خۆی، بۆیە رۆژبەڕۆژ گفتوگۆ بەرەو هەڵدێری پێکنەهاتن دەچوو. هەرچەند هەڵوێستی پارتی بەدرێژایی گفتوگۆ زۆر ئیجابی بوو، بەڵام هەمیشە روبەڕوی هەڵوێستی سیاسیی بەعسییەکان دەبووەوە.

ئەگەر بێتو سەیری راگەیەنراوەکەی بەعس بکەین کە لە١١ی ئازاری ١٩٧٤ بەبۆنەی راگەیاندنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بلاوی کردۆتەوە، دەبینین لەبڕگەیەکدا دەڵێ "دەبێ پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بەزۆر بەسەر کوردستاندا بسەپێنین". لەمەدا باش روون دەبێتەوە کەهەڵوێستی بەعس چۆن بووە لەگفتوگۆکردندا.

لەبەر ئەوەی پرۆژەی هەردولا لەزۆر شوێنو بەڵگەنامەی مێژوییدا بلاو کراونەتەوە، بۆیە من بەپێویستم نەزانیوە پرۆژەکان بنوسمەوە. لەبەر ئەوە من لەیاداشتەکانمدا هەر بەکورتی نوسیومەتەوە. دوریش نیە ئەگەر بۆم کراو خودا دەرفەتی دام، هەموو ئەو شتانە لەیاداشتەکاندا بەدورو درێژی بنوسمەوە.

### ٧ی شوباتی ١٩٧٤

ئەمڕۆ وەفدێکی حکومەتی بەعس بەسەرۆکایەتیی عەلی غەننام، ئەندامی سەرکردایەتیی قوتریی حزبی بەعسو ئەندامەتیی عەزیز شەریف[1] وەزیری داد کە سەر بەلیژنەی ناوەندیی حزبی شیوعیی عیراقو سەرۆکی لیژنەی ئاشتیی عیراقو بەیارەریی وەزیرەکانی ئێمە، بەهەلیکۆپتەر لەبەغداوە هاتن.

وەفدەکە بەبێ ئەنجام گەڕایەوە بۆ بەغدا. دۆخی ڕۆژانە زۆر ئاڵۆز بووە. حکومەت هەندێ کردەوەی ناشیرین دەکاتو پێشمەرگە ڕەدی دەداتەوە.

### ١١ی شوباتی ١٩٧٤:

حکومەتی بەعس جەللادو خوێنخۆر تەها شەکەرچی[2] کردۆتە فەرماندەی تیپی پێنجەم لەهەولێرو ئەمڕۆ گەیشتۆتە ئەوێ. ئەوەی پێویستە بیڵێم ئەوەیە کەئەم کابرایە بەدڕەندەیەکی خوێنڕێژو بێ هەستی

---

[1] عەزیز شەریف کەسایەتییەکی ناسراوی عیراقە. ساڵی ١٩٠٤ لەشاری عانە لەرومادی لەدایك بووە. دۆستی گەلی کورد بووەو باوەڕی بەوە بووە کەدەبێ کورد بەمافی چارەنوس شاد بێ. دەرچوی کۆلیجی مافە لەبەغدار بەپیشە پارێزەر بووە.
ساڵی ١٩٣٧ لەسەر لیستی پارێزگای بەسرە بەئەندامی پەرلەمان هەڵبژێردراوە. ماوەیەك ئەندامی یەدەکی سەرکردایەتی حزبی شیوعیی عیراق بووە. لەساڵی ١٩٦٩ کرایە وەزیری داد لەعیراق. ساڵی ١٩٨٨ لەدەرەوەی عیراق کۆچی دوایی کردووە.

[2] تەها شەکەرچی. ناوی تەواوی تەها نوری یاسین شەکەرچییە. لەدایکبوی تەلەعفەرەو لەساڵانی شەستەکانەوە ئەندامی حزبی بەعس بووە، زۆر ڕقی لەکوردو چەپەکان بوو، بەشدار بوو لەکودەتای ساڵی ١٩٦٣ی حزبی بەعس لەدژی عەبدولکەریم قاسم. ساڵی ١٩٧٤- ١٩٧٥ بەشدار بوو لەجەنگی کوردستان بەڵام لەشەڕەکانی گەلی عەلی بەگو چیای کۆڕەك، لەکاتێکدا کەفەرماندەی تیپی ٨ بوو، شکستی هێناو لەشەڕەکاندا هێزەکانی ژمارەیەکی زۆر کوژراویان لێ کەوت، بۆیە لابراو جەنراڵ سەعید حەمۆ جێی گرتەوە.

مرۆڤانەو کوردکوژ دەژمێردرێ، دەیان تاوانی دژی گەلی کورد کردووە کەنەوەندە دڕندانەن ناتوانم بیاننوسم یان باسیان بکەم.

ناردنی ناوبراو بۆ شارێکی کوردیی وەك هەولێرو کردنی بەفەرماندەی تیپێکی سوپا باشترین نیشانەی نیازی خراپی بەعسییەکانە بەرامبەر بەگەلی کوردو شۆڕش. تەها شەکەرچی لەوتارێکییدا بۆ سوپا، خەڵکی شاری هەولێر باش روونی کردەوە کەحکومەت دەتوانێو بەنیازە سنورێك بۆ ئەو کەسانە دابنێت کە سەرکێشی دەکەن (مەبەستی پارتیو شۆڕشە).

**١٥ی شوباتی ١٩٧٤:**

جارێکی دی عەلی غەننام هاتەوە بۆ گفتوگۆ.

**١٧ی شوباتی ١٩٧٤:**

ئەمرۆ بەڕادیۆ گوێم لەدەزگاکانی بێتەلی شۆڕش گرت بەمەبەستی چاودێری کردنی وەزع، یەکسەر گوێم لەدەزگای بێتەلی مەکتەبی عەسکەری بوو لەناوپردان، بروسکەیەکی لیژنەی باڵای ئاشتیی ئاراستەی بارزانیو دەوائرو وەزیرە پەیوەندارەکان دەکرد.

لەبروسکەکەدا حکومەت دانی بەوەدا ناوە کەهەندێ وردە شەڕ لەنێوان هێزەکانی سوپاو پێشمەرگە هەیە. لیژنەی باڵا لەبروسکەکەیدا دەڵێ: "هەندێ چەکداری سەر بەئێوە ئەمڕۆ تەقەیان لەهەلیکۆپتەرێك کردووە کە بەکاری رەسمی بەسەر ئەو ناوچەیەدا رەت دەبوو. هەلیکۆپتەرەکە ناچار بووە لەگوندێك بنیشێتەوە. ئینجا هەر ئەو چەکدارانە پەلاماریان داوە. تکایە ئەمر بکەن بکشێنەوەو سنورێك بۆ ئەم کردەوانە دانێن کەدەبنە هۆی ئاژاوەنانەوەو تێکدانی رێککەوتننامەی ئازار".

دوا بەدوای ئەم بروسکەیە، لەهەمان لیژنە بروسکەی دووەم گەیشت کەدەڵێ: "هەندێ لەچەکدارەکانتان پەلاماری چەند سەربازێکی بێ

چەکیان داوە کەبۆ مۆڵەت ئیزن درابوون‌و سێ کەسیان لێ کوشتوون‌و چواریشیان لێ بەدیل گرتوون. تکایە ئەمر بکەن سەربازە گیراوەکان بەر بدرێن‌و چیتر رێگا بەم جۆرە کردەوانە نەدرێ".

بەپێچەوانەی درۆو دەلەسەی حکومەت‌و لیژنە باڵاکەوە، هێزێکی سوپا بەیارمەتیی هەلیکۆپتەر پەلاماری ناوچەیەکی سەر بەپێشمەرگەیان دابوو. هەلیکۆپتەر سەربازی چەتربازی دابەزاندبووە هێڵی دواوەی پێشمەرگەکان. بۆیە پێشمەرگەکان هەلیکۆپتەرەکەیان خستە خوارەوەو یەکێکی تریشیان پێکا، لەسەر زەویش ژمارەیەك سەربازیان کوشتبوو، زۆریشیان بریندار کردبوو. دیلیش هەبوو.

**١٨ی شوباتی ١٩٧٤:**

ئەمرۆ تەها شەکەرچی فەرماندەی تیپ بەسەردانێکی عەسکەرییانە هاتە سەربازگەی سپیلك‌و خەلیفان بۆ هاندانی سوپاو چەند وتارێکی پڕ هەڕەشەی دابوو کەسەری یاخیبووەکان پان دەکەنەوە. قسەکانی، بەڕاستی، بۆنی شەڕیان لێ دێت.

بۆ رۆژی دواتر، هاتە رەواندزو هەمان قسەو هەڕەشەی خستە بەرچاوو گوێی خەڵك. لەو رۆژە بەو لاوە، سوپای عیراق کەوتۆتە خۆو ئەمن‌و ئیستخبارات (هەواڵگری) کەوتونەتە جموجوڵ‌و چالاکی‌و زۆریان هاتونەتە ناو شاری رەواندز.

**٢٤ی شوباتی ١٩٧٤:**

ئەمرۆ حەبیب فەیلی‌و وەفدی پارتی جارێکی تر لەبەغداوە گەڕایەوەو عەزیز شەریفیان لەگەڵ هاتبوو تاکو وەڵامی جەنابی بارزانی بۆ حکومەت بباتەوە. وا دیارە چیتر نیاز نیە لێرەوە وەفد بنێرنەوە بۆ بەغدا.

**٢٧ی شوباتی ١٩٧٤:**

ئەمشەو هێزێکی سوپا لەجەلەولاوە کەوتە رێ بەرەو دەربەندیخان. هێزەکە لە ٦٠ زیلی عەسکەریی پڕ سەربازو ٢١ تۆپی مەیدانی زل پێکهاتبوو. لەو ماوەیەدا حکومەتی بەعس کەوتۆتە خۆقایم کردن و لەم رووەوە جموجوڵی سوپایی بۆتە دیاردەیەکی باوو لەژێر پەردەی تاریکیی شەو ئەنجام دەدرێ، ئەویش لەترسی چاوی تیژی شۆڕش و پێشمەرگە.

**١ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ سەرلەبەیانی قومبەلەیەکی تەوقیتکراو لەناو چایخانەی بیلال حاجی عەبدوڵڵا لەهەولێر تەقییەوە. چەند کەسێك کوژران، ژمارەیەکیش لەوانەی لەچایخانەکەدا بون بریندار بوون و هەموو کەرەستەو شتومەکی چایخانەکەش تێك و پێك درا.

ئەوەی پێویستە بڵێم ئەوەیە کەناوبراو بەشیوعی ناسراوەو زۆر شیوعی و خەڵکی بێلایەن دەچونە چایخانەی ئەو، بەزۆریش جێگای پیرەمێردەکان بوو.

شیوعییەکان دوای چەندین ناکۆکیی سیاسی و چەندین شەڕ، لەگەڵ پارتی تێکیان داو پاڵیان دایە حکومەت. بەر لەوەی هێزەکانی شیوعی لەناو شۆڕش چەك بکرێن، شیوعییەکان لەگەڵ حزبی بەعس پێکەوە بەرەیەکیان بەناوی بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازەوە[1] پێکهێناو بەدوو وەزیری شیوعی، واتە موکەڕەم تاڵەبانی و[2] عامر

---

[1] بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز بەرەیەکی سیاسییە ساڵی ١٩٧٣ لەنێوان حزبی بەعس و حزبی شیوعیی عیراق راگەیەنرا. پارتی دیموکراتی کوردستان رازی نەبوو ببێ بەئەندام تێیدا، بۆیە لەدەرەوەی بەرە مایەوە.

[2] موکەڕەم تاڵەبانی لەساڵی ١٩٢٣ لەشاری کفری لەدایك بووە. ساڵی ١٩٦٤ خوێندنی لەکۆلیجی ماف لەزانکۆی بەغدا تەواو کردووە. ئەندامی حزبی شیوعیی عیراق بووە.

عەبدوڵڵا[1]، بەشدار بوون لەحوکم. شیوعییەکان بونەتە جاش دژی شۆڕشی کورد.

**٢ی ئازاری ١٩٧٤:**

جارێکی تر وەفدێکی حکومەت هاتە ناوپردان. وەفدەکە بەسەرۆکایەتیی فوئاد عارف بوو و هەموو ئەندامەکانی کورد بون. وەفدەکە داوای (لەبارزانی) کرد بمێنێتەوەو نەگەڕێتەوە بۆ بەغدا بەڵام بارزانی ڕێگای نەدا نەوەك حکومەت بیکاتە هەڵاو هۆریاو بۆ پڕۆپاگەندەکردن لەدژی شۆڕش، شۆڕش بەوە تاوانبار بکات کەئەندامانی وەفدی حکومەتی دەستبەسەر کردووە.

**٣ی ئازاری ١٩٧٤:**

لەم ڕۆژەدا لەساڵەکانی ١٩٧٢و ١٩٧٣ بەفر باریوە. ئەمڕۆ ڕۆژێکی ساردو تووش‌و زستانییە.

---

لەساڵی ١٩٦٣ بەتۆمەتی کۆمۆنیستبون ٣ ساڵ زیندانی کراوە. لەساڵی ١٩٧٢دا لەناکامی وتووێژی حزبی شیوعیی عێراق‌و حزبی بەعس دەربارەی پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوایەتیی پێشکەوتنخواز، لەسەر لیستی حزبی شیوعی کرایە وەزیری ناودێری‌و لەساڵی ١٩٧٨دا کرایە وەزیری گواستنەوە. لەساڵی ١٩٧٩دا پاش تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان هەردولا، دەستی لەکار کێشایەوە.

[1] عامر عەبدوڵڵا لەساڵی ١٩٢٤ لەشاری عانە لەپارێزگای ئەنبار لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٤١دا لەکۆلیجی مەلیك فەیسەل وەرگیراوە بەڵام دواتر چۆتە میسرو لەکۆلیجی ماف خوێندویەتی. مێژوی پەیوەندی کردنی بەحزبی شیوعیی عێراقەوە دەچێتەوە سەر ساڵی ١٩٤٩و دواتریش بووە ئەندامی سەرکردایەتی. لەساڵی ١٩٧٢دا بەپێی ڕێککەوتنی نێوان حزبی شیوعی‌و حزبی بەعس بووە وەزیری دەوڵەت.

۸ی ئازاری ۱۹۷٤:

ئەمڕۆ کاك ئیدریس بارزانی لەگەڵ وەفدێکی پارتی ڕۆیشت بۆ بەغدا بۆ دوا گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەددام حسێن. شایانی باسە کەڕۆژی پێشتر ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکی کۆماری عیراق نامەیەکی تایبەتی ناردبوو بۆ جەنابی بارزانیو داوای کردبوو یەکێ لەکوڕەکانی بنێرێت بەڵکو لەیەك حاڵی ببنو رای ڕاستەوخۆی بارزانی بزانن.

جەنابی بارزانی بەئیدریسی گوت کوڕم خۆت بکە بەقوربانی ئەم شۆڕشەو بڕۆ بۆ بەغدا، ئەگەر هاتیتەوە ئەوە چاکە، ئەگەر نەشهاتیتەوە تۆش وەکو دەیان شەهیدی کورد ببە بەقوربانی.

۹ی ئازاری ۱۹۷٤:

بەداخەوە سەردانەکە هیچی بەهیچ نەکرد. کاك ئیدریس بەسەلامەتی گەڕایەوە.

۱۰ی ئازاری ۱۹۷٤:

ئەمڕۆ سەعات ٦ی ئێوارە لەسەر داوای حزبی بەعسو حکومەت، زیاتر لەشەش سەد کەس، لەهەموو توێژو چینەکان، کەگوایە کەسانێکی بێلایەنو دیموکراسیخوازن، لەهۆڵی خولد (لەبەغدا) کۆ بوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ناوەڕۆکی ئەو ئۆتۆنۆمییەی کەپێویستە بدرێت بەگەلی کورد. بڕیار وا بوو ئەم کۆبونەوەیە ئێوارەی ۹ی ئازار ئەنجام بدرێ بەڵام دوا خرا چونکە ماوەی داواکردنو کات تێکیان نەدەکردەوە.

ئەم کۆنفرەنسە جەماوەرییە کەگوایە بێلایەنە، لەژێر چاودێری حزبی بەعسو بەهەڕەشەو گوڕەشەی حکومەت ڕێك خراوەو ۸۰٪ی ئامادەبووەکان

سەر بەحزبی بەعس بون، زۆریشیان تۆرانی[1] بوون، تاكو تەرا بێلایەنی تێدا بوو.

كۆبونەوەیەكی وا فراوان تا گفتوگۆ لەسەر كێشەیەكی وا گرنگ دەكاتو بیروڕاكان یەك دەخاو رای هەر یەك لەو ئەندامانە وەردەگرێو سیغەیەكی كۆتایی بۆ ناوەڕۆكی ئۆتۆنۆمی دیاری دەكات، بەنەزاری من بەلایەنی كەمەوە زیاتر لەیەك هەفتە دەخایەنێ.

بەڵام لەهەمووی سەیرترو عەنتیكەترو دیموكراتییانەتری حزبی بەعس، ئەوەیە كەزۆربەی ئامادەبووەكان دوای سەعات شەش گەیشتونەتە شوێنی دیاریكراو كەهۆڵی خولدە، كەچی لەسەعات ١٠ی هەمان شەو بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی لەرادیۆی بەغدا خوێندرایەوە.

سەیری ئەم دیموكراتیەی بەعس بكەن. سەیری ئەو ئۆتۆنۆمییەش بكەن كە بە سێ سەعاتو نیو دیراسە كراو گفتوگۆی لەسەر كراو بۆچونەكانیشی یەكخراونو بەیاننامەشی لەسەر دەركرا.

حەقیقەتی كار ئەوەیە كەچەند مانگێك لەوەو پێش، لەكۆنگرەی هەشتەمی سەركردایەتیی قوتری حزبی بەعس ئەم بەیاننامە بێسوودو ناتەواوە ئامادە كراوە. تەنها مەبەستی بەعس لەم داواكردنەو كۆكردنەوەی بێلایەنو دیموكراسیخوازەكان پەردە دادانە بەسەر رووی خەڵكو فێڵە لەگەڵو رای گشتیی عیراقو عەرەبو جیهان.

بەڵێ. لەسەعات ٩,٣٠دا كۆبونەوەكە تەواو بوو. سەددام حسێنیش وەڵامی پرسیارەكانی دایەوەو سەرپەرشتیی مناقەشەكەشی كرد. ئینجا سەعات دەی شەو بەیاننامە بێماناكەی ئۆتۆنۆمی بڵاو كرایەوە.

---

[1] تۆرانیزم بزوتنەوەیەكی رەگەزپەرستی توركییە لەكۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەتوركیا سەری هەڵداوەو ئامانجەكەی كۆكردنەوەی رەگەزی تورکە لەیەك ئیمپراتۆریەتی توركی. بیروباوەڕەكە دژی كوردو بیروباوەڕی پێشكەوتنخوازە.

**٨ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ کاك ئیدریس بارزانی لەگەڵ وەفدێکی پارتی ڕۆیشت بۆ بەغدا بۆ دوا گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەددام حسێن. شایانی باسە کەڕۆژی پێشتر ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکی کۆماری عیراق نامەیەکی تایبەتی ناردبوو بۆ جەنابی بارزانیو داوای کردبوو یەکێ لەکوڕەکانی بنێرێت بەڵکو لەیەك حاڵی ببنو رایَ راستەوخۆی بارزانی بزانن.

جەنابی بارزانی بەئیدریسی گوت کوڕم خۆت بکە بەقوربانی ئەم شۆڕشەو بڕۆ بۆ بەغدا، ئەگەر هاتیتەوە ئەوە چاکە، ئەگەر نەشهاتیتەوە تۆش وەکو دەیان شەهیدی کورد ببە بەقوربانی.

**٩ی ئازاری ١٩٧٤:**

بەداخەوە سەردانەکە هیچی بەهیچ نەکرد. کاك ئیدریس بەسەلامەتی گەڕایەوە.

**١٠ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ سەعات ٦ی ئێوارە لەسەر داوای حزبی بەعسو حکومەت، زیاتر لەشەش سەد کەس، لەهەموو توێژو چینەکان، کەگوایە کەسانێکی بێلایەنو دیموکراسیخوازن، لەهۆڵی خولد (لەبەغدا) کۆ بوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ناوەڕۆکی ئەو ئۆتۆنۆمییەی کەپێویستە بدرێت بەگەلی کورد. بڕیار وا بوو ئەم کۆبونەوەیە ئێوارەی ٩ی ئازار ئەنجام بدرێ بەڵام دوا خرا چونکە ماوەی داواکردنو کات تێکیان نەدەکردەوە.

ئەم کۆنفرەنسە جەماوەرییە کەگوایە بێلایەنە، لەژێر چاودێری حزبی بەعسو بەهەڕەشەو گوڕەشەی حکومەت رێك خراوەو ٨٠٪ی ئامادەبووەکان

سەر بەحزبی بەعس بون، زۆریشیان تۆرانی[1] بوون، تاكو تەرا بێلایەنی تێدا بوو.

کۆبونەوەیەکی وا فراوان تا گفتوگۆ لەسەر کێشەیەکی وا گرنگ دەکاتو پیروراکان یەك دەخاو رای هەر یەك لەو ئەندامانە وەردەگریو سیغەیەکی کۆتایی بۆ ناوەڕۆکی ئۆتۆنۆمی دیاری دەکات، بەنەزەری من بەلایەنی کەمەوە زیاتر لەیەك هەفتە دەخایەنێ.

بەلام لەهەمووی سەیرترو عەنتیکەترو دیموکراتییانەتری حزبی بەعس، ئەوەیە کەزۆربەی ئامادەبووەکان دوای سەعات شەش گەیشتونەتە شوێنی دیاریکراو کەهۆلی خولدە، کەچی لەسەعات ١٠ی هەمان شەو بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی لەرادیۆی بەغدا خوێندرایەوە.

سەیری ئەم دیموکراتیەی بەعس بکەن. سەیری ئەو ئۆتۆنۆمییەش بکەن کە بە سێ سەعاتو نیو دیراسە کراو گفتوگۆی لەسەر کراو بۆچونەکانیشی یەکخراونو بەیاننامەشی لەسەر دەرکرا.

حەقیقەتی کار ئەوەیە کەچەند مانگێك لەوەو پێش، لەکۆنگرەی هەشتەمی سەرکردایەتیی قوتری حزبی بەعس ئەم بەیاننامە بێسوودو ناتەواوە ئامادە کراوە. تەنها مەبەستی بەعس لەم داواکردنەو کۆکردنەوەی بێلایەنو دیموکراسیخوازەکان پەردە دادانە بەسەر رووی خەلکو فێلە لەگەلو رای گشتیی عیراقو عەرەبو جیهان.

بەلێ. لەسەعات ٩,٣٠دا کۆبونەوەکە تەواو بوو. سەددام حسێنیش وەلامی پرسیارەکانی دایەوەو سەرپەرشتیی مناقەشەکەشی کرد. ئینجا سەعات دەی شەو بەیاننامە بێماناکەی ئۆتۆنۆمی بلاو کرایەوە.

---

[1] تۆرانیزم بزوتنەوەیەکی رەگەزپەرستی تورکییە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەتورکیا سەری هەلداوەو ئامانجەکەی کۆکردنەوەی رەگەزی تورکە لەیەك ئیمپراتۆریەتی تورکی. بیروباوەڕەکە دژی کوردو بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازە.

ئەوەی کەمێك بەوردیو بەبیرێکی تیژو واقیعییانە سەیری بەیاننامەکە بکات، یەکسەر جیاوازییەکی فراوانی لەنێوان داخوازییەکانی گەلی کوردو بیرورا تەسكو شۆڤێنییەکانی بەعس دێتە بەرچاو.

بەیاننامەکە زۆر شارو ناوچەی گرنگو مێژویی لەخاکی کوردستان دادەپچڕێتو قوت دەدات. گەلی کوردیش کەئەوەندە شەهیدو قوربانیی داوەو ئامادەشە زیاتریش بدات، مومکین نیە دەست لەو خاکە هەڵگرێتو واز لەمافەکانی خۆی بێنێت.

**١١ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ سەعات ٩ی بەیانی بروسکەیەکم بەرادیۆ وەرگرت کە لەحکومەتی بەعسەوە ئاراستەی جەنابی بارزانیو سەرکردایەتیی شۆڕش کرابوو. لەبروسکەکەدا سەددام حسێن دەڵێ: "ئەو رایەی کەنوێنەرەکانتان، ئیحسان شێرزاد[1]و دارا تۆفیق[2] لەگەڵ خۆیاندا هێناوە پەسند نیەو

---

[1] ئیحسان شێرزاد کەسایەتییەکی ناسراوی هەولێرە لەسەردەمی عەبدولڕەحمان عارفو ئەحمەد حەسەن بەکردا پێنج جار کراوەتە وەزیر لەوەزارەتەکانی ئەشغالو نیشتەجێ کردنو شارەوانییەکان. ساڵی ١٩٤٦ بەکالۆریۆسی لەکولیجی ئەندازیاریی زانکۆی بەغدا وەرگرتووە دواتر لەئەمریکا بڕوانامەی دکتۆرای وەدەست هێناوە.

[2] دارا تۆفیق ئەندامی سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەساڵی ١٩٢٢ لەسلێمانی لەدایك بووە. لەکۆنگرەی هەشتەمی پارتی بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی. پێشتر ئەندامی حزبی شیوعی بووەو پێش بەستنی کۆنگرەی هەشتەم بەچەند رۆژێك وازی لەحزبی شیوعی هێناوەو پەیوەندیی بەپارتییەوە کردووەو بەهۆی ئیدریس بارزانیو سامی عەبدولڕەحمانەوە دەنگی بۆ کۆکرایەوەو کرایە ئەندامی سەرکردایەتیی پارتی. لەساڵانی ١٩٧١- ١٩٧٤ سەرنوسەری رۆژنامەی "تەئاخی" بوو. بەپیشەی ئەندازیارو دەرچوی یەکێ لەزانکۆکانی بەریتانیایە.

لەساڵی ١٩٧٥دا پاش هەرەس هێنانی شۆڕش ئاوارەی ئێران بوو بەڵام زۆری نەبرد گەڕایەوە بۆ عیراقو وازی لەحزبایەتی هێنا. لەساڵی ١٩٨٠دا لەبەغدا لەهەلومەرجێکی نادیاردا رفێنراو شوێنبزر کرا.

مومکین نیە قبوڵ بکرێت. لەبەر ئەوە، مۆڵەتی ١٥ ڕۆژتان لەپێشە تاکو سەر بۆ بڕیاری حکومەت دانەوێنن‌و بێنە ناو بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و کۆمەکی حکومەت بکەن بۆ جێبەجێ کردنی بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی‌و لەسەعات ٢ی نیوەڕۆی ئەمڕۆ کە ١١ی ئازارە، چاوەڕوانی وەڵامی ئێوە دەکەین‌و لەحاڵەتی رازیبوندا پازدە ڕۆژتان لەپێش دەبێ بۆ هاتنە ناو بەرە، ئەگینا ئێمە پابەند نابین‌و هەقتان دەسوتێ".

لەم بروسکەیەدا دەردەکەوێ کەحکومەتی بەعس بەئاشکراو بەشێوەیەکی بێ ئابڕوویانە دەیەوێ ئۆتۆنۆمییەکەی خۆی بەسەر گەل‌و شۆڕشی کورددا بسەپێنێت‌و بەرهەڵستیی هەموو بڕیارێکی کورد دەکات.

وەزع زۆر ئاڵۆزو شێواوە. شەڕ لەزۆر شوێن هەیەو چاوەڕوانی زۆر شت دەکرێت. ئاووهەواش زۆر ساردەو باران‌و بەفرو رەشەبا ناهێڵن کەس سەر لەئازادی دەربێنێ.

خەڵک دوعا دەکەن وەزع هێمن بێ تا ئەم مانگەش تێدەپەڕێ بەڵکو ئاووهەوا گونجاو بێ بۆ حەوانەوی خەڵک لەپەناگەو ئەشکەوتەکانداو بارانیش نەبارێ.

**١٥ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ دوای دوو ڕۆژ کارکردن‌و یارمەتیدانی ئەم‌و ئەو، دروست کردنی کونە تەیارەکە تەواو بوو و سەریشم داپۆشێ. هەمان ڕۆژ سەر لەئێوارە کردیە بارانێکی زۆر توند. شەویش بەسەردا هات‌و نەمتوانی بیگرم.

**١٦ی ئازاری ١٩٧٤:**

لەخەو هەستام دیتم کونە تەیارەکە بەسەر یەکدا تەپیوەو پڕ بووە لەئاوی باران.

**١٩ی ئازاری ١٩٧٤:**

هەوا خۆش بوو. کونە تەیارەکەم چاک کردەوە.

**٢١ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەوەندە سەرما خوردی بووم، نەخۆش کەوتم.

**٢٨ی ئازاری ١٩٧٤:**

یەك هەفتەیە لەبەر سەرما نەخۆش کەوتوم.

**٢٩ی ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ پاش چەند رۆژێك لەچاوەڕوانییەکی پڕ پەرۆشی، سەعات ٨ی ئێوارە ئێزگەی دەنگی کوردستان، دوای چوار ساڵ بێدەنگیو خەوتن، کرایەوە. لەخۆشییان تەزویەکی گەرمو گوڕ بەناو جەستەی هەموو کوردێکدا بلاو بۆوە، هیواو ئاوات هەلکشاو کەوتە شەقەی باڵ لەئاسۆی بەرزی کورددا.

وتارە بەنرخو گرنگەکەی باوکی کورد[١]، بارزانی، لەبەرنامەکانی ئێزگە خوێندرایەوە.

**٣٠ ئازاری ١٩٧٤:**

ئەمشەو بەیاننامەی مەکتەبی سیاسیی بەرز لەئێزگە خوێندرایەوە. ئێزگە بەڕاستی کارێکی زۆری کردۆتە سەر بیروباوەڕی خەڵك. ئێزگە بۆتە خواردنی شەوانەی گەلی کورد. هاوولاتییان تا گوێ لەئێزگە نەگرن، نان ناخۆن.

ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق لەسەر سێ شەپۆلی مامناوەنج کار دەکا کەدرێژییەکەیان ئەمانەیە: ٢٥٢ مەتری، ٢٠٠ مەتری، ١٦٠

---

[١] "باوکی کورد" نازناوێکە بۆ گەورەکردنی مەلا مستەفا بارزانی، لەو سەردەمەدا زۆر بەکار دەهات. سەرەڕای ئەوەی کەجەوهەر مەلا مستەفای بەباوکی کورد زانیوە، لەکۆتاییشدا هەر ئەو باوکی کوردە بوو (یان کوڕەکانی) کەجەوهەرو بنەماڵەکەی لەناو برد.

مەتری.

هەروەها لەسەر شەپۆلی کورتیش پەخش دەکا کەدرێژییەکەیان ئەمانەیە: ٩٠ مەتری، ٤١ مەتری، ٣١ مەتری.

**٣ی نیسانی ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ دوای ڕەزامەندیی بارەگای بارزانی[1]، ڕێگا درا غاندیی کوڕم لەبەر نەساغیی فتق‌و نەساغیی تر بنێرمە خانە[2] بۆ لای دکتۆر بۆ چارەسەر. لەگەڵ دایکی غاندی، تا حاجی ئۆمەران چووم. هەڵبەت قەدەغە بوو بۆ من بچم بۆ خانە چونکە دەستبەسەرم‌و دەبێ لەگوندی ئازادی دەرنەچم، مەگەر تەنها بۆ دەوروپشتەکەی. هەروەها قەدەغەیە بچم بۆ چۆمان.

**٤ی نیسانی ١٩٧٤:**

ئەمڕۆ هاتنەوە بەڵام غاندی هیچ فەرقێکی نەکردبوو، بەڵکو خراپتریش ببوو. خۆشبەختانە شەو دکتۆر جەبار هاتە لامان. هاتنی زۆر لەجێگای خۆیدا بوو. دوای فەحس کردنی غاندنی، وتی دەبێ ئاگاتان لێ بێ ئەگینا ترسی لێ دەکرێت. هەرچەند غاندی تەمەنی دوو مانگ‌و یەك هەفتەیە، بەڵام دکتۆر دەرزییەکی ئای لێداو سێ چوار دەرزیشی بەجێ هێشت تا من لێی بدەم.

باش بوو زۆر فەرقی کرد. غاندیی کوڕم لەگوندی ئازادی، سەعات ٢,١٥ی بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٧٤ لەدایك بووە. کاتی لەدایکبوونی، کاتێکی زۆر سارد بوو، بەفر یەك بەژن باری بوو. لەو کاتەدا خاڵۆکانی، جەلیل‌و خەلیل، میوان بوون لامان.

---

[1] بارەگای بارزانی دەستەواژەیەکە بۆ شوێنی جێگیربوونی مەلا مستەفا بارزانی‌و هەردوو کوڕەکەی، مەسعودو ئیدریس، لەحاجی ئۆمەران بەکار دەهات.

[2] خانە یان پیرانشەهر شارێکی کوردنشینە لەئێران لەپارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا.

### ١٤ی نیسانی ١٩٧٤

لەزۆربەی بەرەکاندا شەڕ دەستی پێ کردووە. لەم ڕووەوە شەڕ بەتوندی لەسپیلك‌و خەلیفان دەستی پێ کردووە. پێشمەرگە هێرشی بردۆتە سەر ئەو دوو سەربازگەیەو بەتۆپ‌و بەهەموو جۆرە چەکێك لێی داون. ئەم دوو سەربازگەیە گەمارۆ دراون. هێشتا حکومەت نەیتوانیوە ڕێگایان بۆ بکاتەوە.

لەهەمان کاتدا پێشمەرگە پەلاماری ناو گەلی عەلی بەگ‌و ڕەبیەکانی گۆڕەزی چیای برادۆستی داوە. هەردولا زیانێکی زۆریان پێ کەوتووە. پێشمەرگە توانیویەتی پردی یەکەم لەگەلی عەلی بەگ بگرێ‌و بەلای باپشتیان[1] بخاتە روبار. دواتر پردی کونەماریش گیرا. ڕێگای هاتوچۆ بۆ ڕەبیەکانی گۆڕەز نەما. چەندین سریە لەوێ گیریان خواردووە.

شایانی باسە هەر لەمانگی ئازاری رابردووەوە سوپا لەرەواندزو حامیەی باپشتیان کشاوەتەوە بۆ خەلیفان‌و سپیلك‌و بەسەر ڕەبیەکانی گۆڕەزو کۆرەکدا دابەش بووە.

هێشتا فرۆکە نەهاتۆتە سەر ناوچەی باڵەك‌و تەنها لەسەر بەرەی شەڕ دەسورێتەوە.

### ١٥ی نیسانی ١٩٧٤

ئەمشەو حکومەتی بەعس بەهەلیکۆپتەر یەك سریە مەغاویری[2] مەشق پێکراوی لەسەربازگەی سپیلك دابەزاندو هەمان شەو ناردییە ناو

---

[1] باپشتیان گوندێکە لەناحیەی دیانای سەر بەقەزای سۆران لەپارێزگای هەولێر.

[2] مەغاویر یان کۆماندۆ یان هێزی تایبەت هێزێکی مەشقپێکراوی سوپای عێراقە بەمەبەستی هێرش‌و پەمارلادان‌و گرتنی شوێنەکان. لەساڵانی ١٩٧٤- ١٩٧٥دا عێراق ٣ لیوای مەغاویری هەبوو، واتە هەر لەشکرێك (فەیلەق) فەوجێکی مەغاویری بۆ هەر تیپێك تەرخان دەکرد.

ڕەبیەکانی سەرەوەی گوندی سەرچیای حسێن ئاغای سورچی[1]. بەری بەیان، پێشمەرگە دای بەسەریانداو فەسیلێکی ٣٠ کەسیی بەئامر فەسیلەوە ئیبادە کرد، لەوانە چواریان بەساغی دەرچون، ئەوانیش بەدیل گیران و نێردرانە بەندیخانەی خەلان.

٢٢ی نیسان

دوای چەند ڕۆژێك شەڕی گەرم و خوێناوی، هێزێکی گەورەی سوپای حکومەت توانی ڕێگای خۆی ببڕێ و بگاتە سەربازگەی سپیلك. بەمەش تەوقی گەمارۆدانی شکاندو ورەی سوپاکەی سپیلکی بەرز کردەوە، ئەو سوپایەی کە لەبرسان و لەبەر کەم ئازوقەی جەنگی، لەوپەڕی ورە نزمی و خراپیدا بوو چونکە تەنها بەفڕۆکەی هەلیکۆپتەر شتی بۆ دەچوو. سوپا هەر لەم هێرشەشدا گەیشتە خەلیفان.

٢٣ی نیسان

بۆ یەکەم جار دوای وتووێژ، چەند فڕۆکەیەك هاتنە سەر ناوچەی باڵەك و بۆردومانیان کرد. فڕۆکەیەکی باجەر (تۆپۆلیف ٢٢) بەپاسەوانیی دوو فڕۆکەی سیخۆی شەڕکەر، سەر لەئێوارە هاتنە سەر ناوچەکەو بۆمبیان هاوێشتە دەوروپشتی چۆمان و گەلاڵەو قەسرو ماکۆس. هیچ زیانیان نەدا. تۆپە تەیارە شکێنەکان کەوتنە تەقە لێ کردنیان و بەجارێك ئاسمانیان کردە یەك پارچە ئاگر.

ئەوەی شایانی باسە، فڕۆکەی تۆپۆلیف ٢٢ دەستکردی روسە. فڕۆکەیەکی بۆمبهاوێژی خاوەن چوار ماتۆڕی زۆر زل و زەبەلاحە، بەجارێك ١٢ بۆمبای یەك تەنی هەڵدەگرێ و دەهاوێ، دوو شەستیری ٣٠ ملیمی و چەند ساروخێکیش هەڵدەگرێ.

---

[1] حسێن ئاغا خدر ئاغای سورچی سەرۆکی هۆزی سورچییەکان بووەو برای عومەر ئاغای سورچییە.

فڕۆکەی سیخۆش فڕۆکەیەکی شەڕکەرە بۆ ئامانجی زەمینیو دژی پیادەو پشتیوانیی فڕۆکەی زل بەکار دێت.

**٢٤ی نیسان**

ڕۆژی ماتەمو کارەسات. ئەمڕۆ سەعات ٩,٤٥ دەقیقە، دوو فڕۆکەی سیخۆ ٧ بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك بۆمبارانی شارە هێمنو جوانەکەی قەڵادزێیان کرد. ئەم شارە جوانو چاونەترسە کەتازە زانکۆی تێدا کرابۆوەو قوتابییەکانی خەریکی دەرسو خوێندن بوون، هیچ بەرگرییەکی وای دژی فڕۆکە لێ نەبوەو کتوپڕ فڕۆکەکان بەچەشنێکی دڕندانە پەلاماریان داوەو مردنو ئاگریان بەسەر شارەکەدا باراندووە.

لەچاوتروکانێکدا ١٢٤ کەس شەهید کرانو ٥١ کەسیش بریندار بوون کە زۆربەیان ژنو منداڵو پیر بوون. لەناو ئەم هەموو کوژراوانەدا تەنها یەك پێشمەرگە هەبوو. نزیکەی ١١٨ خانوو رمانو تێك دران، لەوانە ٤٧ دوکانو چایخانەو لۆقەنتە (ئوتێل)، دائیرەی قایمقامو قوتابخانەی سانەوی‌و بەشێکی نەخۆشخانە.

زۆر ماڵ بەتەواوی لەناو چوونو ناسەواریان بڕایەوە.

بەجۆرە، بەعسییە دڕندەکان لەکەیەکی رەشیان خستە سەر نێوچەوانیان لەدژی گەلی کورد. ئەم رۆژە لەمێژوی گەلی کورددا ناو نراوە رۆژی ماتەمو شەهید. بەڕاستی کارەساتێکە هیچ فاشستێك ئەنجامی نەداوە، مەگەر نازییەکانی ئەڵمان.

ناوی ئەو فڕۆکەرانەی کە لەم بۆردومانە بەرپرسە سالم سوڵتان بەسوورییە کەخەڵکی موسڵە.

**٢٦ی نیسان ١٩٧٤**

ئەمڕۆش بەهەمان شێوە هەڵەبجە بۆمباران کراو دەیان خانوو بەسەر خاوەنەکانیاندا رماو لەژێریدا مردن. لەم شارە بێدەسەڵاتەدا ٣١ شەهیدو

ژمارەیەک برینداری هەیە.

**٢ی ئایاری ١٩٧٤**

ئەمڕۆ دەروازەی ئێران کرایەوەو دەیان خێزان بەسنوردا ڕەت بوون‌و چوونە خاکی کوردستانی ئێران. دەوڵەتی ئێران هەزارەها چادری هەڵداوەو کامپی مەدەنیی کردۆتەوەو بۆ جێگیرکردنی خەڵکی پەککەوتەو هەڵاتوو و ئاوارەی کوردستانی عیراق.

**٣١ی ئایاری ١٩٧٤**

ماوەیەک لەمەوبەر، وردتر یەک دوو ساڵ لەمەوبەر، ناکۆکی لەنێوان بارزانی‌و عوسمانی برازای[1]، کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزان[2]، پەیدا ببوو.

ناکۆکییەکەی ئەوان شێوەیەکی بنەماڵەیی‌و عەشیرەتگەری هەیە. محەمەد خالیدی[3] برای عوسمان دەوری هەبوو لەم ناکۆکییەدا. کەم کەم

---

[1] عوسمان کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانییە. پاش کۆچی دوایی باوکی، هەوڵیدا جێی بگرێتەوە بەڵام مەلا مستەفا دژی ئەم هەوڵەی وەستایەوەو ویستی محەمەد خالیدی برای ببێ بەشێخی بارزان چونکە محەمەد خالید خەزووری مەسعود بارزانی بوو. بەجۆرە، ململانێیەکی سەخت لەنێوان عوسمان‌و محەمەد خالید دروست بوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش، مەلا مستەفا تەنگی پێ هەڵدەچنی‌و لەدواییدا هێرشی بردە سەر بارزان‌و دەری کرد. ئەویش وازی لەشۆڕش هێناو چوو بۆ موسل. دکتۆر مەحمود عوسمان نوسیویەتی کەمەلا مستەفا لەساڵانی حەفتاکاندا تەنها یەک جار چووە بۆ شەڕ، ئەویش بۆ دەرکردنی عوسمان لەبارزان.

[2] شێخ ئەحمەد بارزانی سەرکردەی ئاینیی بارزانییەکانە. کەسێکی دەستپاک‌و خۆشەویست‌و نیشتمانپەروەر بوو. تا ئەو مابوو، هیچ کێشەیەک لەنێو بارزانییەکاندا نەبوو. پاش کۆچی دوایی لەساڵی ١٩٦٩، شێخایەتیی بارزان کۆتایی هات.

[3] محەمەد خالید کوڕی گەورەی شێخ ئەحمەد بارزانی‌و خەزووری مەسعود بارزانییە. مەلا مستەفا بارزانی لەدژی برازاکەی خۆی کەعوسمانی کوڕی شنخ ئەحمەد بارزانییە، پشتگیریی کرد بۆ ئەوەی شێخایەتیی بارزان بگرێتە دەست. شێخ محەمەد خالید لەساڵانی شەڕی عیراق-ئێراندا یارمەتیی لەئێرانییەکان وەرگرت‌و حزبوڵڵای کوردی دامەزراند.

ناکۆکییەکە زیادی کردو شێوەی هەندێ داخوازیی وەرگرت وەك لێدانی زێبارییەکانو چەك کردنیان[1]. زێبارییەکان خاڵۆی مەسعود بارزانین. هەروەها عوسمان داوای بەرەڵاکردنی بنەماڵەی ئێمەشی دەکرد[2]. هەڵبەت عوسمان ئێمەی کردبوو بە بەڵگە بۆ راستو دروستیی داخوازییەکانی، ئەگینا ئێمە لەکوێو داخوازییەکانی ئەو لەکوێ.

بەهەر حاڵ، چەند جارێك بارزانی خۆی تەدەخولی کرد بەڵام بۆی چارەسەر نەکرا. عوسمان هەر بەلاملی مایەوە، هەرچەند نفوزیشی زۆر کەمی کردبوو. مەسەلەکە بەجۆرە مایەوە تا ئەمڕۆی هەینیی ۳۱ی ئایار. ئەمڕۆ عوسمان لەگەڵ چەند کەسێکدا بەخێزانەوە لەڕێگای باڵنداوە لەزێی مەزن پەڕییەوە.

هەرچەند شۆڕش زۆر هێزی پێشمەرگەی خستبووە سەر ڕێگای، بەڵام ئەو ڕێگاکەی گۆڕی بوو، پێشمەرگەکانیش شەڕیان لەگەڵ نەکردبوو، بەڵکو ئەویش بەناو پێشمەرگەدا ڕەت ببوو و زۆر ڕێزی لێ گیرا بوو. مەبەستی عوسمان چوون بوو بۆ موسل بۆ ناو حکومەت.

بارزانی خۆی چوو بوو بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە بەڵام پێی ڕانەگەیشتبوو، بەقاسدیش نەگەڕایەوەو بەناو ناوچەی زێباریدا ڕۆیشت.

---

[1] پاش بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰ مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ ئەو زێبارییانە ئاشت بۆوە کەچەکیان دژی شۆڕش هەلگرتبوو، بارزانییەکان زۆر بەمە قەلس بوون، بەتایبەتی کەمەلا مستەفا نەك هەر لەگەڵ زێبارییەکاندا ئاشت ببۆوە بەڵکو دەسەڵاتێکی زۆریشی پێ دان کەگەیشتە رادەی هەڕەشەکردنی زێبارییەکان لەبارزانییەکان. مەلا مستەفا بەو جۆرە سەیری مەسەلەکەی دەکرد کەژنەکەی زێبارییەو خاڵەکانی مەسعود بارزانی هەموویان زێبارین. بۆیە نەیدەویست کێشەی لەگەڵیاندا هەبێ بۆ ئەوەی زێبارییەکان پشتگیری لەمەسعودی کوڕی بکەن.

[2] عوسمان دژی گرتنی بنەماڵەی محەمەد ئاغای مێرگەسۆری بوو، داوای لەمەلا مستەفا دەکرد ئازادیان بکا. ئەمەش وای لەمەلا مستەفا کردبوو وا تێ بگات کەبنەماڵەی مێرگەسۆری پشتگیری لەعوسمان دەکەنو دژی بنەماڵەی مەلا مستەفان.

**٤ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ شێخ عوسمان بارزانی لەگەڵ نزیکەی ٢٠٠ کەس کەزۆربەیان شێروانین گەیشتە موسڵو پارێزگاری موسڵ پێشوازیی لێ کرد.

چوونی ناوبراو کارێکی خراپ بوو بۆ شۆڕشو بنەماڵەی بارزانی. لەرێگادا لوغمێك لەژێر پێی هەندێ لەپیاوەکانی تەقی بۆوەو زۆری لێ کوشتبوونو هەندێکیش بریندار بوون.

دوای گەیشتنی بۆ موسڵ، یەکسەر بروسکەی بۆ سەرۆکی کۆمار لێداو پاڵپشتیی خۆی بۆ حکومەت دەربڕی بوو و نارەزایی لەشۆڕشو جەنابی بارزانی نیشان دابوو و جنێویشی دابوو.

**٥ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

عوبەیدوڵلای کوڕی مەلا مستەفا[1] کەئەویش لەیاخیبووەکانەو وەزیری دەوڵەتە لەحکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر، چووە پێشوازیی ئامۆزای خۆی (لەموسڵ)و دڵخۆشیی حکومەتی پێ راگەیاندو بەخێرهاتنی لێ کردو لەگەڵ خۆی بردی بۆ بەغدا.

**٦ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ لەناو ئاژاوەی خەونێکی ناخۆشو نارەحەتدا هۆشیار بوومەوە. کەوتمە شك کەشتێك دەقەومێ. هەر لەو گومانەدا بووم، کاتێك خالید محەمەد زاخۆیی لێپرسراوی پاسەوانەکانی ماڵی باوکم لەچۆمان هاتە ماڵەوە لەئازادیو پاسەوانێکی تری لەگەڵدا بوو. دوای کەمێك دانیشتن،

---

[1] عوبەیدوڵلا کوڕی گەورەی مەلا مستەفایە لەژنە بارزانییەکەی، مەلا مستەفا زۆر رقی لێ بوو. جارێکیش گرتیو زیندانیی کرد بەڵام ئەو لەزیندان رایکردو چوو بۆ بارزان بەڵام باوکی وازی لێ نەهێنا. لەکۆتاییدا عوبەیدوڵلا ناچار بوو خۆی رادەستی رژێمی عیراق بکاو لەبەغدا دابنیشێ. لەساڵی ١٩٧٥ مەلا مستەفا داوای لەکوردێکی لوبنانی کردبوو کەناوی جەمیل محۆیە، عوبەیدوڵلا تیرۆر بکات. هەر چۆنێك بێ، لەکۆتاییدا عوبەیدوڵلا بەدەستی سەددام حسێن کوژراو تا ئێستا شوێنبزرە.

لێم پرسی خێرە بۆچی هاتون؟
خالید گوتی هاتوینەتە شوێن جەنابت. باوکتو حەمید[1] ئێستا لەگوندی خەلانن، منیان ناردووە بۆ لای تۆ کەبتبینن.
زۆرم لا سەیر بوو. باوکمو حەمید بەماڵەوە لەمەکتەبی دیلزەن. کەیو چۆن چونەتە خەلانو چۆن من نەمزانیوە. دواتر، بۆچی ناردویانە بەشوێنمدا؟ بەهەر حاڵ، گومانم لەڕاستیی قسەکە کرد. بەخالیدم گوت:
-باشە. بەڵام بەتەنها لەوێن، یان بەماڵەوە؟
گوتی:
-ئەوان پێشتر هاتون. ماڵیشیان ئەمڕۆ دەگاتە لایان.
قسەکەی ماقوڵ نەبوو چونکە ئەگەر مەسەلەکە ماڵ گواستنەوە بێت، باوکمو حەمید تا ماڵ تێك نەنێنو بەڕێیان نەکەن، ناچنە ئەوێ.
بەهەر حاڵ، تێگەیشتم کەدەبێ بارەگای بارزانی ئەوانی ناردبێتە ئەوێو وا هاتونەتە شوێن منیش بۆ دەستبەسەرکردنم.
هەڵسانو خواحافیزیم لەماڵەوە کردو پێم گوتن چاویان لەغاندی بێت نەوەك تاخیر بم. ترومبێل (ئوتومبیل) لەبەر دەرگا وەستا بوو کەکۆنە قەمەرەیەکی مارسیدیسی رەش بوو. سوار بوین. من لەپێشەوە، خالیدیش لەنێوان منو شوفێردا. پاسەوانەکەش لەدواوە.
چووین بۆ خەلان. لەنزیك ئاوایی دابەزین. یەکسەر من چوومە لای شێخ عەبدوڵڵا کە لەبەر دەرگای مزگەوت وەستا بوو. دوای یەکتر ماچ کردن، گوتی : "بەڕاستی عاجزم لەبەر باوکتو ئەوان. پیرەمێردێکی وا بەرگەی ئەم حاڵە ناگرێ". دەستی بۆ بینای قوتابخانەکەی خوارەوە درێژ کردو گوتی "وان لەناو قوتابخانەکە".

---

[1] حەمید کوڕی خەزووری فاخری محەمەد ئاغای مێرگەسۆرییە.

منیش لەگەڵ خالید دابەزیمو بۆ یەکەم جار دوای سێ ساڵ چاوم بەباوکم کەوتو تێروپڕ دەستەکانیم ماچ کرد. ئەویش بەشێوەیەکی پڕ سۆزو میهرەبانی یەك دوو جار نێوچەوانی ماچ کردم. حەمیدیشی ماچ کرد.
دانیشتین. باوکم عاجز دیار بوو. لەڕاستیدا منیش لەدڵی خۆمدا پەستو تووڕە بووم. ئەم بگرەو بەردەی لەگەڵ ئێمەدا دەکرێت، کارێکی بێ مانایە.
باوکمو حەمید بەماڵو خێزانەوە دەستبەسەر بون. دەستەیەك پێشمەرگە لەبەر دەرگا پاسەوان بون، بەبێ پاسەوان نەدەچونە سەر ئاو. پاسەوانەکان وەك سێبەر لێیان جیا نەدەبونەوە. ئەمە چیە؟
من لەگوندی ئازادی دەستبەر بووم. هەرچەند پاسەوانیان بۆ دانەنا بووم بەڵام بەدزییەوە لەژێر چاودێریدا بووم. منیش نەدەچومە شوێنی دوور.
باشە چی رویداوەو چی کراوە تا پێویست بەم کارە بکاتو جارێکی تر لەخاوو خێزانم دور بخرێمەوە. ئەو هەموو ماڵو منداڵو ژنە بێدەسەڵاتە بەبێ کەسو بەبێ پیاو گوناهیان چیە؟
بەهەر حاڵ، دەمزانی ئەم کارە پەیوەندیی بەوەوە هەیە کەعوسمان چۆتە ناو حکومەتو بۆتە جاش. بەڵام ئەمە پەیوەندیی بەئێمەوە چیە؟ عوسمان براو برازای خۆیانەو لەبنەماڵەی خۆیانە. بۆچی ناکۆکیی ناو خۆیان بەئێمە دەکوژێننەوەو بۆچی شەڕی نارەوای خۆیان بەسەر ئێمەدا بشکێتەوە؟
ئەگەر دنیا وێران ببێت، ئێمە پەیوەندیمان پێوە نیە. ئەوان[1] ئەگەر یەکتر بخۆنو ببڕنەوە هیچ خێرو چاکەی بۆ ئێمە تێدا نیە. ئێمە هیچ کات کارمان بەسەر کاروباری ناو ئەم بنەماڵەیەوە نیە. بەڵام ئێمە ئەمەشمان بەسەیر نەزانی، چونکە کاتی خۆی، لەساڵی ١٩٧١دا، کاتێك عوبەیدوڵڵا رۆیشتو لەباوکی یاخی بوو، ئەوان پەلاماری ئێمەیان دەداو کارەکەیان لەسەر ئێمە حیساب دەکرد. شێخ عوسمان هەمان ساڵ یاخی بوو. دیسان

---

[1] مەبەست بنەماڵەی بارزانییە.

ئەمەیان لەسەر ئێمە حیساب کرد. ئەم هەڵوێستە زۆر دوور بوو لەڕاستیو ڕیژدان چونکە ئێمە پێڵاوی بارزانی بەهەموو دنیا نادەینو ئەگەر کەسێکیشمان لەوان[1] خۆش بویو ڕێزی لێ بگرین، لەبەر چاوی ڕەشی جەنابی بارزانییەو بەس. هەر کەسێك لەبارزانی یاخی ببێ، لەئێمەش یاخی بووە.

**٧ حوزەیرانی ١٩٧٤**

دووەم ڕۆژی گرتنمان. نامەیەکم بۆ کاك ئیدریسو کاك مەسعود نوسیو ئەو حەقیقەتەم تێدا رون کردەوە کە وا ئێوە ناهەقن کەئێمە بەم جۆرە گرفتانە دەبەستنەوەو ئێمە رازی نین بگیرێینو ببین بەداردەستی ئەمو ئەو. رازیش نین کەسانی وەك عوسمانو عوبەیدوڵلا ئێمە بکەن بەکوتاڵو لەبازاڕی خۆفرۆشتندا عەرزمان بکەن. پێم گوتن دەبێ ئێوەش باش بزانن کاتێك خۆفرۆش لەڕێگای راست لادەداو بیەوێ پێستی بێ نرخی خۆی لەلای حکومەت بەنرخ بخات ، حەتمەن دەبێ شتێك بەدەمەوە بگرێ تاکو بایەخیان پێ بدرێتو دەبێ وای پیشان بدەن کەئەمو ئەویان لەگەڵ دایە، بۆیە دەبێ ئێوەش حیسابی ئەم شتە بکەنو بەچاوێکی موجەرریب (تاقیکراوە) سەیری بکەن چونکە دوژمن دەیەوێ هەتا هەتایە ئەو ناخۆشییە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا هەر هەبێتو گەورەتریشی بکات. ئێوە چۆن ئەم مەجالە دەدەن.

لەدواییدا پێم گوتن ئەگەر ئێمە عوسمانمان ویستبێ، ئەوا ئەمە لەبەر چاوی بارزانی بووە. ئەوەی دوژمنی بارزانییە، دوژمنی ئێمەشە.

**١٠ حوزەیرانی ١٩٧٤**

داوامان کرد بوو ڕێگامان بدەن ماڵەکانیشمان بۆ خەلان بهێنین بەلام

---

[1] مەبەست گروپی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانییە کە لەگەڵ بنەماڵەی مەلا مستەفا بارزانی ناکۆك بووە.

موافەقەت نەکرا، تەنها من نەبێ کە لەئازادی بووم و بەتەنهاش بووم.

حەقیقەتی هۆی گرتنمان ئەوەیە کەخەڵکی سوودخۆر (هەلپەرست)و بەرژەوەنددار لەچەوساندنەوەی ئێمە، چوونی عوسمانیان بەدەرفەت زانیوەو کەوتونەتە زمان لێدانی ئێمە کەگوایە باوکمو ئێمە دەستمان تێدایە، ئەویش بەبیانووی ئەوەی کەچەند کەسێك لەشێروانییەکانی ئێمە، لەگەڵ عوسمان چوون، ئەویش لەترسی محەمەد خالید.

حیسابی ئەوەیان نەکردووە کەباوکم بەو پیریو هەشتا ساڵییەوەو بەو هەموو جەرگانەی[1] کە وا لەبەندیخانەکاندا زیندانی کراون، چۆن دەڕواتو دژایەتییان دەکات. حیسابیان بۆ ئەو هەموو خزمەتە نەکردووە کەباوکم بەدرێژایی تەمەنی بۆ بنەماڵەی بارزانیو بۆ کوردی کردووە. چۆن وا بەئاسانی، باوکم ئەمە بەفیرۆ دەداتو چۆن ریشی خۆی دەداتە دەست ئەمو ئەو، ئەم ریشەی کە لەناو بەسەرهاتو لەبەر خۆری خزمەت کردندا سپیی کردووە. ئاخر بنەماڵەی ئێمە چۆن مێژوی خاوێنی خۆی لەکەدار دەکاتو پشت لەگەلو شۆڕشی کورد دەکات.

ئیتر ئەوانە بەچاوێکی سەتحیو نزیکبین سەیری وەزع دەکەنو لەسەر بناغەیەکی دوور لەڕاستی بڕیار دەدەنو ئیجرائات دەکەن.

**١١ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ لەسەر بڕیاری بارەگای بارزانی، محەمەد عەزیز[2] نامەی بۆ خالید ئاژگەیی، لێپرسراوی بەندیخانەی خەلان، نارد کە جێگاو ڕێگا بۆ ماڵی من پەیدا بکات تاکو ماڵم بێنمە خەلان.

---

[1] لەپەیڤینی نێو خێڵەکاندا وشەی "جەرگ" بەمانای کوڕو برازا دێو لێرە بەپێی رستەکە مەبەستی کوڕەکانی محەمەد ئاغا مێرگەسۆرییە، واتە ئەسعەد، جەمیل، ڕەشید، مەجید، سەعید، فاخرو خەلیلی برازای محەمەد ئاغا مێرگەسۆری.

[2] محەمەد عەزیز یان حەمە عەزیز بەرپرسێکە لەبارەگای بارزانی.

پێش نیوەڕۆ پیکابێکم گرتو ماڵەکەم گواستەوە. خوا خێری شێخ عەبدوڵلا بنوسێ هەر لەحەساری خۆی دوو ژووری پێ دام، ماڵەکەم تێ دانا.

بەهاتنی ماڵی من، هەندێ قیوودیش لەسەرم سستتر بوو و توانیم شەوانە لەماڵەکەم بخەوم.

هەندێ شتومەکی ناوماڵم لەئازادی لەناو خانووەکە بەجێ هێشت. هەڵبەت بێستانیشم کردبوو. ئەویشم بەتەمای حەسەنە ڕەش بەجێ هێشت. بەڵام بەزۆری لەخەمی لایکای سەگەکەم دام کەنەمتوانیوە لەگەڵ خۆم بیهێنم. جاروبار لەگەڵ پاسەوانەکان سەری بێستانەکەم دەدەم.

### ٢١ی حوزەیرانی ١٩٧٤

یەکەم ڕۆژی هاوینە. زۆر گەرم بوو. ئەمڕۆ چەند بیروڕایەکم لەبارەی هەندەسەوە بۆ کاك مەسعود بارزانی نوسی وەك تەقاندنی بۆمبا بەدەنگو بەهۆی ئاوێنەو ئاسن فڕین‌و[1] بەکارهێنانی گوللەی قازیفەو ساروخ بۆ ئەم مەبەستەو ئاراستە کردنی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ڕوەو تانكو ئالیاتی دوژمن‌و هەروەها بەزۆر ڕێوشوێنی تریش. ئەم شێوازە تا ئێستا کەس بەکاری نەهێناوە.

### ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٧٤

پاسەوانەکان کەپاسەوانیی باوکم‌و ماڵەوە دەکەن، گۆڕدران‌و گەڕانەوە. زۆربەیان خەڵکی ناوچەی زاخۆ بوون. بەڕاستی کەسانێکی خراپ نەبوون. لێپرسراوەکەیان، خالید محەمەد، زۆر باش بوو، بەڵام ترسنۆك بوو. هەمان ڕۆژ دەستەیەکی تر جێگای ئەوانی وەرگرت لەخەلان‌و بوونە پاسەوانی ئێمە.

---

[1] مەبەست ئەو وردە ئاسنەیە کە لەکاتی تەقینەوەی بۆمبدا دەوروبەری خۆی دەتەنێتەوەو زیان دەگەیەنێ.

سەردەستەکەیان ناوی ئەحمەدە. کوڕێکی مونەددەبو ئاقڵو ڕووخۆشە. ئەمانیش هەر سەر بەهێزی هەڵگوردن. ژمارەیان هەشت پێشمەرگەیە. ئەو پێشمەرگانە بەکۆچەر بەناوبانگن. ئەحمەد خەڵکی گوندی مەرونە لەسەر جادەی نێوان دهۆكو زاخۆ.

**٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ تەمەنی غاندیی کوڕم دەبێتە پێنج مانگی ڕەبەق. هەمیشە نەساغە لەبەر کەم چارەسەر چونکە من دەستبەسەرم.

هەر ئەمڕۆ وەڵامی نامەی هەندەسەو سێ پێشنیارەکەی باوکمو حەمیدم لەڕێی محەمەد عەزیزەوە بۆ هاتەوە[١]. محەمەد عەزیز ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئێمەو بارەگای بارزانییە.

**٢٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ لەبەرەبەیاندا هێرشێکی زۆر گەورەی سوپا بەیارمەتیی جاشەکانی لیژنەی مەرکەزی[٢]و جاشی ترو بەپشتیوانیی سەدان تانكو تۆپو فڕۆکە، کرایە سەر بەرەیەکی فراوانی هێزی سەفینو دەشتی هەولێر. بەرینیی هێرشەکە لەوەدا دەردەکەوێ کەبەرەیەکی فراوانی گرتۆتەوە، لەدەربەندی گۆمەسپانو دۆڵی سماقوڵیو چیای کروژەوە تا هیزۆپو بەرەیەکی تریش

---

[١] بەپێی رستەکە، دیارە محەمەد ئاغای مێرگەسۆریو حەمید بەمحەمەد عەزیزدا نامەیان بۆ مەلا مستەفا بارزانی یان بۆ یەکێ لەکوڕەکانی ناردووەو سێ پێشنیاریان خستۆتە بەردەمی. دەقەکە هیچ رونکردنەوەی دەربارەی سێ پێشنیارەکە تێدا نیە.

[٢] مەبەست میلیشیاکانی حزبی شیوعیی عیراقە کە لەو کاتەدا هاوپەیمانی حزبی بەعس بوون لەبەرەی نیشتمانیو نەتەوایەتیی پێشکەوتنخواز. لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا دوو حزبی شیوعی لەعیراقدا هەبوو و هەردوکیشیان یەك ناویان هەبوو کەحزبی شیوعیی عیراقە، بۆیە بەیەکێکیان دەوترا لیژنەی مەرکەزی (ل. م) کەهاوپەیمانی حزبی بەعس بووەو بەوەی دیکە دەوترا قیادەی مەرکەزی (ق. م) کەدژی حزبی بەعس بووە. لەدەقەکەدا لیژنەی مەرکەزی بەشێوەی ل. م بەکار هاتووە.

لەدەشتی کۆیەوە تا حاجی قەڵاو شیوەشان.

سوپا بەیەك ڕۆژ لەدەربەندەوە تا دۆڵی ئەسحابانو هیزوپی گرت. نزیکەی ١٥٠ تا ٢٠٠ دەبابە بەشدار بووە.

خێرایی پێشڕەویی سوپا نیشانی دەدا کەبەرهەڵستیی هێزی پێشمەرگە زۆر کەم بووە[1].

### ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٤

شەڕ هەر لەوپەڕی توندیو خوێناویدا بەردەوامەو دوژمن هەر بەرەو پێش دەڕوات، تا داری قەمتەرانی گرتووەو لەزێرگەکان وەستاوە. هێزێکی تری بەرەو لای سکتان کەوتوتە جموجوڵ. بەرگریی پێشمەرگە کەمەو زیان زۆرە. بەتالیۆنێکی هێزی هەلگورد کەوتە ڕێ بۆ پاڵپشتی هێزەکانمان.

### ١ی تەموزی ١٩٧٤

شەڕ هەر بەردەوامەو سوپا لەهێزۆپەوە بەرەو گوندی سکتان دەڕوات. ئەمڕۆ پێشمەرگە پاڵەوانانە شەڕ دەکات بەڵام جیاوازیی ژمارەو هێزو شتومەك زۆرەو بەهۆی تانکەوە تەرازوی پێشمەرگە لەنگەو دوژمن زاڵترە.

پێشمەرگە زۆر زیانی لەجەیشو جاش داوە بەڵام لەتوانادا نیە دوژمن رابگیرێ. هەمان ڕۆژ هێزێکی تری سوپا لەمیراوەی نزیك شەقڵاوەوە حەرەکەتی کرد بۆ لای گوندی بەرەکەو پاش سوتاندنی گوندەکە لەوێش ڕەت بوو.

دوژمن دەیەوێ لەگەڵ هێزەکەی تری سکتانو سەری بازن یەك بگرێتەوەو هێزەکانمان دەرباز نەبن بەڵام شوکر هێزەکانمان زووتر دەرباز ببون. مەترسی هەیە زۆر شتی ئێمە کەوتیبێتە دەست دوژمن.

---

[1] وەك لەدەقەکەدا دەردەکەوێ، جەوهەر زۆر لەپێشڕەویی سوپایی عیراق نیگەران بووەو هەستی کردووە هێزی پێشمەرگە توانای بەربەرەکانەوەی هێرشەکانی سوپای عیراقی نیەو سەرکردایەتیی شۆڕشیش جگە لەپشت بەستن بەئێران بۆ ڕاگرتنی پێشڕەویی سوپای عیراق هیچ پلانێکی دیکەی نیە.

**٢ی تەموزی ١٩٧٤**

دوژمن توانی بگاتە دۆڵی نازەنین‌و هیران‌و کەوتۆتە دورخستنەوەی پێشمەرگە لەخۆی. هەزاران ماڵ‌و خێزان لەترسی پەلاماری دڕندانەی دوژمن شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە و پەرت‌و بڵاو بوون. زۆریان بەڕوتی رزگاریان بووە و زۆربەیان بەرەو ناوچەی باڵەك كەوتنە رێ.

هەر ئەمڕۆش هەندێ لەناوچەی قەرەداغ كەوتنە دەست پێشمەرگە. هێزەكانی قەرەداغ‌و كەركوك‌و زۆربەی هێزی رزگاری كەوتونەتە تەنگ هەڵچنین بە حكومەت‌و سوپا.

**٣ی تەموزی ١٩٧٤**

دوژمن مەبەستەكانی لەم هێرشە هێنایە دی، ئەویش بەدەركردنی هێزەكانی پێشمەرگە لەدەشتی هەولێرو سەفین‌و سەربازگەیەكیشی لەگوندی زراران داناوەو دەستی بەسەر ناوچەكەدا گرتووە.

خەتای ئەم شكانەی پێشمەرگە لەملی سەركردەو كاربەدەستەكانە چونكە بەر لەسێ چوار رۆژ دوژمن هێزی كۆكردۆتەوەو زانراوە كەسەدان تانك بۆ ئەم هێرشە ئامادە كراوە بەڵام كاربەدەستانمان هیچ حیسابیان بۆ تەئسیری تانك نەكردووەو تەقویەی هێزەكانیشیان نەكردووە.

پێشمەرگە لەبەر بێئومێدبون لەوەزع‌و كاربەدەستان، وەك جاران شەڕ ناكا. زیانی پێشمەرگە لەم شەڕانە زۆر زۆر بووە. نزیكەی سەد شەهید هەیە، بێجگەلە بریندارو بزرو بێجگەلە زیانی مەدەنییەكان.

بەڵام هەر ئەمڕۆ پێشمەرگەكانی هێزی زمناكۆ پەلاماری دوژمنیان دا لەچیای زمناكۆو ملەكەوەو توانیان دوژمن داماڵن‌و دەیان سەرباز بكوژن‌و بەدیل بگرن‌و دەست بەسەر زۆر شتومەكدا بگرن.

**٤ی تەموزی ۱۹۷٤**

ئەمشەو لەخۆشیی خەبەری زمناکۆو قەرەداغ، لەچۆمان بەبێ ماناو بەلاش تەقەی خۆشی کراو هەزارەها فیشەك بەلاش بەفیڕۆ درا.
لەئەنجامی ئەم تەقە بێ مانایەدا ژنی حەمیدی ئێمە کوژرا. لەکاتی هاتنە دەرەوەی، گوللەیەك بەر سەری کەوت‌و بەری دایە خوارەوە. بەنیوە گیان گەیەندرایە شاری خانە (لەئێران) بەلاّم زۆری نەبرد گیانی سپارد.
لەو کاتەدا ئێمەو حەمید لەخەلان دەستبەسەرین.

**٥ی تەموزی ۱۹۷٤**

ئەمڕۆ حەمید (لەکوژرانی ژنەکەی) ئاگادار کرایەوەو ڕۆیشت. ئەمەش هەر کارەساتێکە لەچوارچێوەی ئەو هەموو کارەساتەی توشی هاتوین. خودا ڕەحمان پێ بکات.

**٦ی تەموزی ۱۹۷٤**

ئەمڕۆ سەر لەئێوارە کردیە هەورو تریشقەو سەرما. شەویش هەندێ باران باری، بەلاّم لەدیوی ئێران دوو سێ ڕۆژە بارانە. زۆر سەرمایە. ناچار بووین چاکەت‌و ساقۆ بکەینە بەر.

**٧ی تەموزی ۱۹۷٤**

سەرما هەر بەردەوامە. هەورو ڕەشەبایە. ئەمڕۆ شەش فڕۆکە: دوو باجەڕو چوار سیخۆ هاتن‌و بۆمبارانی هەندێ شوێنیان کرد.
هەروەها ئەمڕۆ دیسان پاسەوانەکانمان گۆڕدران‌و جەماعەتێکی تر لەهەلگوردەوە هاتنە شوێنیان. جەماعەتی پێشتر بۆ بەرەی سەفین نێردران.
بەڕاستی ئەحمەدی سەردەستە شوێنی خۆی لەناو دڵی ئێمە کردبوەو زۆر مەمنونین.

جەماعەتە تازەکەش هەر سەر بەهێزی هەلگوردن بەلاّم تازە هاتوونو یەکەم جارە چەك وەردەگرن. گێل‌و نەزانن. لەناو ژیانی پێشمەرگایەتیدا نەتواونەتەوە، لێپرسراوەکەیان نەبێ کەناوی فازلە، پێشمەرگەیەکی کۆنە بەلاّم زۆر بەسەروبەر نیە.

۱۲ی تەموزی ۱۹۷٤

ئەمڕۆ لەنیوەی شەوەوە تا سەعات ۱۲ی ئەم نیوەڕۆیە، هاتوچۆ قەدەغە بوو. لام وایە هەندێ چەك‌و شتی تازەمان بۆ هاتووە[1]. فڕۆکەش هەر بەردەوامە لەسەر سوڕانەوە بەسەر ناوچەکەدا.

۱٥ی تەموزی ۱۹۷٤

ئەمڕۆ سەعات ۸,۱۰ ئێزگەی دەنگی کوردستان راپۆرتێکی بلاّوکردەوە لەبارەی ئەم هەموو هێزو چەکەی کەحکومەتی بەعس خستویەتیە مەیدانی شەڕی دژی گەلی کوردو ئەو زیانە گیانییەی کەپێی کەوتووە.

راپۆرتەکە بەشێوەی لێکۆلینەوەیەکی سیاسی- عەسکەری بوو، نزیکەی حەوت هەشت دەقیقەی خایاند. راپۆرتەکە ئەم ژمارانەی رون کردەوە کە لەسەر بناخەی لانی کەم‌و بێ زێدەڕۆیین:

لە ۱۱ی ئازارەوە تا سەرەتای مانگی تەموز، دوژمن ئەم هێزانەی فرێداوەتە مەیدانی شەڕ:

یەکەم: فرقەی ۱، فرقەی ۲، فرقەی ٦، فرقەی ۸و نیوەی فرقەکانی۳و ۱۰. ئەم هەموو تیپە بەچەك‌و جبەخانەی تەواوەوە هاتون. سەرجەمی گشتی دەبێتە ۷۰ فەوج لەسوپادا.

دووەم: ۲٥ کەتیبەی تانك.

سێیەم: رێژەی گشتی ۸/٦ی سوپای عیراق لەشەڕدا بەشدار بووە، بێجگە

---

[1] ئاماژەیەکە بۆ گەیشتنی بڕێکی زۆری چەك‌و تفاق لەئێرانەوە بۆ شۆڕش، بەتایبەتی پاش پێشڕەوییەکانی سوپای عیراق‌و زیادبونی کاریگەریی هێرشە ئاسمانییەکانی عیراق.

لەهەزاران جاش.

چوارەم: تانکەکان هەموی تازەن‌و دەستکردی روسن، لەجۆری: ت ٤٥، ت ٥٤، ت ٦٢.

پێنجەم: هەموو جۆرێکی فرۆکەی باجەر (تۆپۆلیف ٢٢)، لیووشن، مێگی ١٧و ١٩و ٢١، هۆکەر هەنتەر، سۆخۆی ٧و سۆخۆی ٢٠.

شەشەم: لەهەمان ماوەدا زیاتر لە١٦٠٠ سەرباز کوژراون‌و ٢٨٠٠یش بریندارن.

ئەمە کورتەی راپۆرتەکە بوو. بەلاّم راپۆتەکە باسی زیانی تری دوژمنی نەکردووە لەفرۆکەو تانك‌و تۆپ‌و ترومبێل‌و چەکی تر. هەروەها ئیشارەتیشی بەزیانەکانی شۆرش‌و هێزە بەشدارەکانی هێزی پێشمەرگە بەرامبەر بەو هێزە مەزنەی دوژمن نەکردووە.

ئەم راپۆرتە ئەنجامی ئەو پرسیارو وەلاّمەیە کەئێزگەی دەنگی کوردستان لەگەلّ مەسعود بارزانی سازی کردبوو. مەسعود بارزانی لەوەلاّمی پرسیارێکدا گوتی: "سوپای دوژمن لەهەر رۆژێکدا نزیکەی ١٠٠ تەن تەقەمەنی فرێ دەداتە سەر کوردستان‌و ئەگەر هێرشەکەی گەورە بێت زیاتر لەم برە بەکار دێنێ". هەروەها گوتی "زیانی ماددیی عیراق لەهەر رۆژێکی شەردا نزیکەی نیو ملیۆن دینارە". هەروەها گوتی "دوژمن لەهەندێ شەری مەزن وەك شەرەکانی دەشتی هەولێرو دەشتی کەرکوك‌و زاخۆو سەفین نزیکەی ٢٠٠ تانکی خستۆتە مەیدانی شەرەوە".

هەروەها گوتی "قەبارەی زیانی دوژمن لەیەك کات‌و ماوەدا بە بەراورد لەگەلّ سالّەکانی تری شەر، لەو ماوەیەدا گەیشتۆتە رادەی کوژرانی ١٦٠٠ سەرباز، کەچی پێشان بەیەك سالّ ئەوەندە زیانەی لێ نەدەکەوت".

تێبینی: ئەمرۆ کودەتایەکی سوپایی لەقوبرس رویداوە کەئەفسەرە یۆنانییەکان کردویانە. وردەکاری لەلاپەرەکانی دواترە.

**١٦ی تەموزی ١٩٧٤**

دوای نیوەڕۆ باوکم ناردی بەشوێن خالید ئاژگەیی بەڕێوەبەری بەندیخانەی خەلان، بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەن با ئەویش داوا لەمحەمەد عەزیز بکات هێنانی ماڵەکانمان بۆ خەلان دوا بخرێت، چونکە کەلکی ئەوە نەماوە ماڵو منداڵ لەشوێنێکی وا سارددا لەناو چادر ئیدارە بکەن.

دەوروبەری کاتی نوێژی ئێوارە، خالید ئاژگەیی لەگەڵ حەسەن ناسرو یەك دوو پێشمەرگە هاتنە ژووری ئێمە. من خەریکی خوێندنەوەی پەرتووکی "جەنگی یەکەمی جیهان" بووم، باوکیشم چوو بووە مزگەوت بۆ نوێژ. باوکم تەشریفی هێنایەوەو کەوتینە پرسیارکردن دەربارەی وەزعی شەڕو چۆنیەتیی شەڕکردنو کشانەوەی هێزەکانی دوژمن لەناوچەی هیرانو نازەنین. حەسەن ناسر کتێبەکەی لێ وەرگرتمو کەوتە سەیرکردنی وێنەکانی.

ئێمە لەو گفتوگۆیەدا بوین، دەنگی فڕۆکە هاتو بووە گرمەگرم. چەند دەقیقەیەكو بەجارێ بووە گرمەی دۆشکەو تۆپی فڕۆکەشکێنو لەگەڵ هاڕەو گرمەی دەنگی فڕۆکەکانو دەنگی بۆمباکانیان تێکەڵاو بوو.

لەپەنجەرەی ژوورەکە چاومان لەلولەی ئەو دوو دۆشکایە بوو کە لەسەر بەردەزەرد دامەزرا بون. بەڕاستی جوان بون. وەك بروسك ئاگری لەدەم دەردەچوو بەرەو فڕۆکەکان.

ژمارەی فڕۆکەکان سێ فڕۆکە بوو: باجەرێكو دوو سۆخۆی بەسەر ئازادیو حاجی ئۆمەراندا دەسوڕانەوەو دەچونە سەر زینوەو خەلان.

بەڕاستی دەنگی تۆپی ٦٠ ملم زۆر نازدارو خۆش بوو، بەجارێك ئاسمانی پڕکردبوو لەگوللە. باجەرەکە نزم بوو. هەر کەگوللەکان بەنزیکیدا رەت دەبون، وەك تیر بەشێوەیەکی دینگەیی (ستونی) بەرز دەبوەوە بۆ ئاسمان تا لەڕادەی مەدای تۆپەکان بچێتە دەرێ، بەلام بەر لەوەی بەرز ببێتەوە، باری خۆی سووك کردو یەك زنجیرە بۆمبای فڕێدایە خوارەوە کە ناوچەیەکی

فراوانی گرتەوە، لەپشتی زینوەی شێخەوە تا ئاشی شێخ لەخوار ئازادی. یەکێك لەبۆمباکان لەناو گوندی ئازادی لەسەر چەقی جادەی دابوو. بۆمباکان زۆر کاریگەر نەبون بەڵام شێوەیەکی نوێیان هەبوو: بەرمیلێکی نزیکەی ٥٠سم درێژو بەقەد زۆپایەك ئەستور. بەرمیلەکە تەنك بوو، بەڵام لەناو هەر بەرمیلێك دە دوانزە موشەکی پەروانەدار هەبوو. هەر کەبەرمیلەکە دەکەوێتە سەر زەوی‌و لێك دەبێتەوە، موشەکەکان هەر یەکەیان بۆ خۆی دەتەقێتەوە.

بەرمیلێك لەوانە کەوتبووە ناو ئازادی. سێ چوار لەموشەکەکان نەتەقی بوون. ئەوانی تریش کەمێك دیواری سەر جادەیان تێکدا بوو، بەڵام زیانی گیانیی لەکەس نەدابوو.

بەرمیلێکی تریش کەوتبوە نزیك ئاشی شێخی لەسەر روبار، یەکێکیش لەخوار زینوە. هیچیان زیانی گیانیان نەبوو.

سەر لەئێوارە کردییە هەورو با. شەو هەور ئاسمانی داپۆشی‌و کردییە ترێشقەو گرمە گرم. شەو درەنگ هەندێ بارانی هوورد باری‌و سەرماو رەشەبا زۆر بەقوەت بون.

### ١٧ی تەموزی ١٩٧٤

ئەمرۆ سەعات ٧,٥ی ئێوارە سەرۆکی کۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر بەبۆنەی ئاهەنگ گێڕانی یادی کودەتای ١٧ی تەموزی ١٩٦٨وە، وتارێکی سیاسی‌و عەسکەری‌و ئابوریی خوێندەوە کەنزیکەی ٥٥ دەقیقەی خایاند.

### ٢٠ی تەموزی ١٩٧٤

ئەمرۆ سەعات شەشی بەیانی، دە هەزار سەربازی کۆماندۆی تورك لەئاسمان‌و دەریاوە دابەزینە سەر دورگەی قوبرس‌و زۆربەی بەندەرەکان‌و فرۆکەخانەکانیان داگیر کردو کەم کەمە تەقە دەستی پێ کرد لەسەر هێڵی نێوان یۆنانییە قوبرسییەکان‌و تورکە قوبرسییەکان.

ئەوەی پێویستە بیڵێم ئەوەیە کە لەڕۆژی دوشەممەی ١٥ی تەموز ئەفسەرە یۆنانییەکانی کەسەرپەرشتیی هێزە نیشتمانییەکانی قوبرس دەکەن، بەیارمەتیی هێزە نیشتمانییەکانی قوبرس کودەتایەکی سوپاییان دژی قەشە مەکاریۆس سەرۆکی کۆماری قوبرس کرد.

کودەتاکە زۆر خوێناوی بوو. زیاتر لە ٣٠- ٤٠ کەسی تێدا کوژراو دەیان کەس بریندار کران. لەکۆتاییدا کودەتاچییەکان توانییان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر وڵاتو نیقۆسیادا بسەپێنن.

گەلی قوبرس بەرهەڵستیی کودەتاکەی کرد بەڵام دەرەقەتی کودەتاچییەکان نەهات. قەشە مەکاریۆس رایکردو پەنای بردە بەر هێزە ئاشتی پارێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان. رۆژی دووەم کودەتاچییەکان لەدەریاوە هێرشیان کردە سەر بارەگای تازەی مەکاریۆس‌و لەزەویشەوە هەر پەلاماریان داو دەریانپەڕاند. مەکاریۆس بەفڕۆکەیەکی سوپایی ئینگلیزی لەدورگەکە هەڵاتو خۆی گەیاندە ناو ئینگلیز تاکو لەوێوە بچێ بۆ نیویۆرک‌و شکایەت بکات لەلای نەتەوە یەکگرتووەکان.

هەمان رۆژی کودەتاکە، سەرەك وەزیرانی تورکیا پۆلەند ئەجەوید لەئێوارەدا بەپەلە خۆی گەیاندە بریتانیاو لەگەڵ هارۆلد ویلسۆنی سەرەك وەزیرانی ئینگلیز لەبارەی قوبرسەوە کەوتە گفتوگۆ.

پێویستە (لێرەدا) پەنجە بۆ رێککەوتننامەکەی ساڵی ١٩٦٠ی نێوان تورکیاو ئینگلیزو یۆنان لەبارەی چارەنوسی ئەم دورگە بچوکەوە درێژ بکەم.

لەساڵی ١٩٦٠دا شەڕێکی خوێناوی لەنێوان تورك‌و یۆنانییەکانی دانیشتوانی دورگەی قوبرس بەرپا بوو. دەیان کەس لەهەردولا کوژران‌و نەتەوە یەکگرتووەکان ناچار بوو دەست بخاتە ناو دورگەکە بۆ وەستاندنی شەڕ. لەکۆبونەوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هەر سێ لایەنی پەیوەندار کەوتنە مشتومڕو راوێژ بۆ (گەیشتن بە)رێککەوتننامەیەك لەبارەی

وەزعی قوبرسەوە. هەرسێ لایەنەکە تورك‌و ئینگلیزو یۆنان بون. تورکیا بەناوی بەرگری لەگروپی تورك‌و یۆنانیش بەناوی بەرگری لەگروپی یۆنانییەکان کە زۆرینەیەو ئینگلیزیش بەبیانوی ئەوەی کە لەکۆنەوە داگیرکەری ئەم دورگەیە بووەو هەندێ رێککەوتننامە لەنێوان ئینگلیزو خەلکی قوبرس هەیە، چوونە ناو مەسەلەکە.

بەمجۆرە، هەر سێ لایەن کۆبونەوەو رێککەوتننامەیەکیان مۆر کرد کەهێزێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ناوبژی بچێتە دورگەکەو هێزەکانی ئینگلیز بکشێنەوە، دەست لەدورگەکە هەلگرن‌و سەربەخۆیی بدرێت بەقوبرس. هەروەها نزیکەی ٦٥٠ نەفسەری یۆنانی بنێردرێن بۆ قوبرس بۆ سەرپەرشتی‌و سەرکردایەتی کردنی هێزە نیشتمانییەکانی قوبرس‌و سەرەك وەزیرانی دورگەکە یۆنانی بێت‌و جێگرەکەی لەتورکەکان بێت‌و هێلێك لەنێوان هەردوو تایفە دیاری بکرێت بۆ ئەوەی خوێنیان نەرژێ.

هەروەها رێککەوتننامەکە دەلێ: ئەم سێ لایەنە مافی ئەوەیان هەیە لەکاتی پێویستدا لووت بژەنە ناو کاروباری دورگەکە، هەروەها هەر یەکێکیش لەم سێ لایەنە (واتە تورکیاو ئینگلیزو یۆنان) مافی ئەوەی هەیە لەکاتی تەنگاویداو لەکاتی تێکدانی رێککەوتننامەکەدا لووت بژەنە ناو دورگەکەو سنور بۆ تێکدەر دابنێن.

بەمجۆرە تورکیا مافی ئەوەی بەخۆی دا کەدورگەکە داگیر بکات.

دوای ئەوەی سەرەك وەزیرانی تورکیا سەرنەکەوت لەقایل کردنی ئینگلیز بەوەی کە پێکەوە بچنە ناو دورگەکە، بریتانیا هەموو چارەسەرێکی عەسکەریی فرێدایە لاوەو هەولیدا بەئاشتی‌و راوێژکردن ئەم کێشەیە چارەسەر بکات. دوای گەرانەوەی سەرەك وەزیرانی تورك، ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا لەناکاو کۆبۆوەو بەنهێنی بریاریدا بەهێزی سوپا قوبرس داگیر بکات بۆ لادانی کودەتاچییەکان.

تورکیا کەوتە خۆی‌و هێزی لەباشوری ولات کۆکردەوە و هەموو

دەنگوباسێکی قەدەغە کردو سەدان تانكو تۆپو کەشتیی جەنگیی ئامادە کرد.

جۆزیف سیسکۆی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بەپەلە گەیشتە لەندەنو لەگەڵ هارۆلد ویلسۆنو نوێنەری تورکیا کۆبۆوەو دواتر ناردیان بەشوێن نوێنەری یۆنان.

بەگوێرەی باس، وا دەردەکەوێ کەئەمریکا حەز لەقەشە مەکاریۆس ناکاو بەکاسترۆی[1] دەریای ناوەڕاستی دەزانێو نایەوێ بێتەوە سەر حوکم. لەوەدا دەردەکەوێ کەئاژانسی ناوەندیی هەواڵگریی ئەمریکاش لەکودەتاکەدا دەستی لەگەڵ یۆنان تێکەڵاو کردووە. ئەمریکا دەری خست کەدەبێ ئەو تاقمە کودەتاچییە لابدرێ بەڵام ناشبێ مەکاریۆس بچێتەوە سەر حوکمو دەبێ یۆنان ئەفسەرەکانی بە هی تر بگۆڕێ.

گۆڕینی ئەفسەرەکان زۆرتر رای ئینگلیزە. لەڕاستیشدا گۆڕینی ئەفسەرەکان هیچ چارەسەر نیە بۆ ئەم کێشەیە چونکە ئەفسەرە یۆنانییەکان هەمان ئەفسەرە یۆنانیەکانن مادام رژێمی وڵات لەگەڵ کودەتاکەدا بێت. ئەم رایە قبوڵ نەکراوەو قەشە مەکاریۆس بەفڕۆکە فڕی بۆ نیویۆرکو ئەمڕۆ وتارێکی دورو درێژ دەداتو داوا لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات دەستوەردان بکاتو رژێمە عەسکەرییە تازەکەی نیکۆلای سامسۆنو دەستەو دایرەکەی لابەرنو خۆی بهێننەوە سەر کورسیی حوکمڕانی.

نوێنەری روسیاش لەنەتەوە یەکگرتووەکان بەتوندی داوای لابردنی

---

[1] کاسترۆ سەرۆکی کووبا لەساڵانی ١٩٥٩- ٢٠٠٨. رابەرایەتیی شۆڕشێکی جەماوەریی کردووە لەکوباو توانیویەتی رژێمی فەرمانڕەوا بڕوخێنێو رژێمێکی سۆسیالیست دابمەزرێنێ. پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیێتدا هەبوو و زۆر دژی ئەمریکا بوو. ماوەی ٤٩ ساڵ حوکمی کردووە. ساڵی ٢٠٠٨ بەهۆی نەخۆشییەوە دەستی لەکار کێشایەوەو لەساڵی ٢٠١٦دا کۆچی دوایی کرد.

کودەتاچییەکانی کردو مافی بەمەکاریۆس دا.
دوای ئەوەی هەموو هەوڵەکانی ئاشتی بۆ چارەسەرکردنی وەزع شکستیان هێنا، هێزەکانی تورکیا هەر ئەو شەوە کەوتنە رێو لەبەیانییەکەدا دورگەکەیان داگیر کرد. هەر کەگەیشتە ئەوێ، سەرەك وەزیرانی تورکیا لەبەیاننامەیەکی رەسمیدا گوتی "لەبەر ئەوەی هەموو هەوڵێکی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەرکردنی باری ئێستای قوبرس شکستی هێناوەو سەری نەگرتووە، تورکیا ناچار بووە لەپێناوی مرۆڤایەتیدا (واتە لەپێناوی تورکیادا)و لەپێناوی دورخستنەوەی شەڕو لەپێناوی خەڵکی قوبرسدا، داوا لەسوپا بکا دورگەکە داگیر بکاتو هیوادارە کە بەبێ تەقەو خوێنڕشتن دەست بەسەر دورگەکەدا بگرێ".
فرۆکەکان کەوتنە فڕین بەسەر نیقۆسیای پایتەختداو کەشتیی جەنگی لەدووریی چەند کیلۆ مەترێك لەدورگەوە وەستانو کەشتییە بارو سەرباز هەڵگرەکانیش لەبەندەرەکان لەنگەریان گرتو سەدان تانكو تۆپ راکێشرانە سەر زەوی.
پۆلەند ئەجەوید سەرەك وەزیرانی ئێستای تورکیا نۆزدەهەمین سەرەك وەزیرانی تورکەو لەساڵی ١٩٢٥دا لەئەستەنبول لەدایك بووە. ساڵی ١٩٥٥ نوێنەری ئەنقەرە بوو لەپەرلەمانی تورکیاو ساڵی ١٩٦٠ بووە بەجێگری سەرۆکی پەرلەمانی تورکو ساڵی ١٩٧٤ بووەتە سەرەك وەزیرانو سەر بەپارتی کۆماری تورکیایە کە کۆنەپەرستترین حزبە. وەزارەتەکەی ئەجەوید ئیئتیلافییە.
شایانی باسە کەتورکیاو یۆنان هەردوکیان ئەندامن لەپەیمانی ئەتڵەسیو[1] سەنتۆو[1] هەر لەکۆنەوە هەمیشە نێوانیان ئاڵۆزو ناژاوەیە،

---

[1] پەیمانی باکوری ئەتلانتیك کە بەناتۆ ناسراوە پەیمانێکی سوپاییە ئەمریکا لەساڵی ١٩٤٩ دایمەزراندووە. بارەگاکەی لەشاری برۆکسلی پایتەختی بەلژیکایە. ئەندامە

واتە هەر لەو کاتەوە کەهێزە سوپاییەکانی یۆنان، لەسەردەمی کەمال ئەتاتورك، زۆربەی خاکی رۆژئاوای تورکیایان داگیر کردووە. بۆ مێژوو ئەوە دەڵێم کە لەو کاتە تەنگاوو مێژووییەدا کەمال ئەتاتورك کەیەکەم سەرۆکی کۆماری تورکیایە پەنای بردە بەر گەلی کورد لەکوردستانی تورکیا تا یارمەتیی بدەن بۆ دەرکردنی هێزەکانی داگیرکەرو بەڵێنی پێ دان کەدوای سەرکەوتن خودموختاری (ئۆتۆنۆمی) بدا بەکوردەکان.

لەبەر ساویلکەیی سەرکردە کوردەکان‌و پیاوانی ئاین‌و شێخەکان، ئەمانە بەجارێ گەلیان هانداو بەناوی جیهادی پیرۆزەوە کەوتنە کۆڕی شەڕ دژی سوپای یۆنان، یۆنانییەکانیان دەرکردو خاکی رۆژئاوای تورکیایان رزگار کرد.

کورد زۆر ساویلکەو نەزان بوو کەئەو دەرفەتە زێڕینەی شەڕی تورك- یۆنانی وەدەست نەهێناو مافی رەوای خۆی لەبیر چۆوەو باوەڕی بە بەڵێنە نادروستەکەی ئەتاتورك کردو هەزارەها رۆڵەی کورد لەو جەنگە بونە سوتەمەنی. دوای وەستانی شەڕ ئەتاتورك لەجیاتی ئەوەی بەڵێنەکەی بێنێتە دی، کەوتە کوشتن‌و بڕینی کورد بەجۆرێك کەئەگەر باس بکرێت، قەڵەم لەنوسین دەوەستێ.

وەزعی قوبرس زۆر ئاڵۆزو شێواوە. دور نیە یۆنانیش بەسوپا پەلاماری هێزەکانی تورك بدات بەبیانوی بەرگری کردن لەیۆنانەکانی قوبرس. بەڕاستی دەرفەتێکی باش بوو بۆ تورکیا، چونکە زۆر لەکۆنەوە بەدوای

دامەزرێنەرەکانی بریتین لەم دەوڵەتانە: ئەمریکا، بەلژیکا، کەنەدا، دانمارك، فەرەنسا، ئایسلاند، ئیتالیا، لوکسمبورگ، هۆڵەندا، نەرویژ، پورتوگال‌و بەریتانیا.

[1] سەنتۆ پەیمانێکە ساڵی ١٩٥٥ لەبەغدا پێك هێنراوەو لەو کاتەدا پێی دەوترا پەیمانی بەغدا. ئەندامەکانی بریتی بون لەعیراق، تورکیا، ئێران، بەریتانیاو پاکستان. پاش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، عیراق لەپەیمانەکە کشایەوە. بۆیە ناوەکەی کرایە سەنتۆ کەکۆکراوەکەی "پەیمانی رێکخراوی ناوەندییە" بەزمانی ئینگلیزی.

دەرفەتێك دەگەڕێ پەلاماری ئەو دورگەیە بدات، تەنانەت بەدوای ئەوەشدا دەگەڕێ کەپەلاماری یۆنانیش بدات بۆ تۆڵەسەندنەوەی کۆن.

دە با بزانین باری سیاسیو عەسکەریی ئەو ناوە سەر لەچی دەدات.

سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ ئێزگەی کوێتو بەیروتو عەممان هەموویان بڵاویان کردەوە کەشەڕی زۆر زۆر توند لەنێوان داگیرکەرەکانو یۆنانییە قوبرسییەکان هەیە. تا ئێستاش نیقۆسیای پایتەخت نەگیراوەو شەڕ لەناو کۆڵانو جادەکان دایە.

هەروەها گوتیان نوستولەکانی ئەمریکا (ئوستولی شەشەم) لەدەریای ناوەڕاست کە لە ٤٥ کەشتیی جەنگی پێکدێ، لەهەڵگری فڕۆکە، هەروەها هەندێ کەشتیی سۆڤێتو بریتانیاو یۆنان بەرەو ناوچەی قوبرس بەرێ کەوتون.

هەروەها ئێزگەکان تەئکیدیان کردەوە کەحەوت تیپی چەتربازی سۆڤێتی لەدۆخی ئامادەیی تەواو دان. هەندێ پاپۆڕی جەنگیی ئەمریکی گەیشتونەتە بەندەری کرینیاو بەندەرێکی تر کەهێزەکانی تورکیا داگیریان کردووەو ئەو هێزانە رێگایان بەو کەشتییە جەنگییانەی ئەمریکاو ئینگلیز داوە بچن هاووڵاتییەکانی خۆیان رزگار بکەن. هەروەها هەندێ هێزی کۆماندۆی ئینگلیزیش گەیشتۆتە ئەوێ.

سەعات ٤ی ئێوارە ئێزگەی لەندەن گوتی "تەعبیەی گشتی کراوە لەیۆنانو سەدان تانكو تۆپو چەکی تر بەرەو سنور کەوتۆتە رێ". وا دیارە سەرکردە سوپاییەکانی یۆنان باوەڕیان نەدەکرد تورکیا ئەم هێرشە بکاتو هەر بەهەڕەشەیان زانیوە بەس.

### دیسان ٢٠ی تەموزی ١٩٧٤

ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ من خەریکی رەسم کردنی تابلۆ زلەکەی "بووکا بێری" بوم کە لەمانگی رەمەزانی ١٩٧٣ دەستم پێ کرد بوو، بەڵام لەبەر

باری ئاڵۆزو گۆڕاوی دەروونیو ژیان دەستم زۆر لێ شل ببوو. بەهەر حاڵ، ئەم بەهارەی ١٩٧٤ توانیم زۆربەی تابلۆکە تەواو بکەم. تا ئەمڕۆ وازم لێ هێنابوو. ئەمڕۆ خەریکی هەندێ زیڕو بازن بووم ئەمخستە ملو گەردنو دەستی راستی تابلۆکەم.

تابلۆکە ژنە کوردێکی باڵا بەرزو رێکوپێكو بەکەلوپەلو بەرگی عەشیەتی شێروانیو بەرپەڕی خۆڕازاندنەوەیە، تاسو بۆشی لەسەر، لەبێریی مەڕو بزن دەگەڕێتەوەو کارۆلەیەکی ساوای لەباوەشەو بەدەستی راستیش پەقرەجێکی پڕ شیری هەڵگرتووە. بزنەکەش بەدوای کارۆلەکە رادەکاتو لووتی بەرز کردۆتەوە بۆ لای سەری کارۆلەکە. بێرییەکەش بەزەردەخەنەیەکی شیرینەوە دەرواو ورشەی ددانە وردو جوانەکانی دەبریقێتەوە، سەیری دیمەنی کارو بزن دەکاتو بیر لەسۆزی دایك بۆ کۆرپەکەی دەکاتەوە. خۆیشی ئەم چارەنوسەی لەپێشەو دەبێتە دایکی کۆرپەلەیەکی جوان.

لەپشتیشیەوە دیمەنێکی جوان لەزنجیرە چیایەکی بەرزو سەر بە بەفر لەکەشی بەهارو پەڵە هەوری سپی، ئاسمانی شینی رازاندۆتەوەو دەشتاییو ناو بەرزو نزمی، کۆتایی بەدامێنێ چیاکان دێنن.

خەریکی رەسم بوم کەگڕەی ترومبیلێك لەخوار پەنجەرەکەوە هاتو وەستا منیش فلچەم هەر بەدەستەوە بوو و سەرەو خوار سەیرم کرد. دیار بوو دایکی غاندی وا دادەبەزێو غاندیشی لەباوەشە، دایکیشم دیار بوو دوا بەدوای ئەو دادەبەزێ.

بەپەلە بەپیر دایکەوە چوومو دەستم ماچ کرد، ئەویش نێوچاوانی ماچ کردم. ماوەی شەش مانگ دەبێ دایکم نەدیوە.

پاشان غاندیم لەدایکی وەرگرت. غاندی لەبرسان دەگریا بەڵام کەچاوی پێ کەوتم گریانی لەبیر چۆوەو کەوتە پێکەنین. غاندی تەمەنی شەش مانگ کەم پێنج رۆژە.

بەڵام بەداخەوە باسێکی ناخۆش بەتەواوی ئاڵۆزی کردمو وەزعی تێکدام، چونکە هەواڵی وەفات کردنی عەزیزی ئێمەو پیاوچاکو مێر سەریو عەشیرەتی شێروانی، سوار ئاغای کوڕی محەمەد ئەمین ئاغای شێروانییان پێ دام کە وا بەر لەیەك دوو مانگ لەمەوبەر فەرمانی خوای لەبەندیخانەی رایات بەجێ گەیاندووە[1].

سوار ئاغا خزمێکی نزیكو لەبنەماڵەی ئێمەیە. پیاوێکی سادەو جوامێرو خاوێنو رەشیدو تفەنگچی بوو. لەسەر کێشەی ئێمە گیرا بوو. لەگەڵ رەشیدو مەجیدو ئەسعەدو خەلیلو خزمانی تر لەیەك ژور بوون (لەبەندیخانە).

نازانم داخوا چۆن مردووە. ئایا وەفاتی سروشتییە یان لەژێر ئازارو تەعزیبدا تەواو بووە[2]. دەڵێن گوایە نەساغ بووە و لەژێر عەمەلیات لەخەستەخانەکانی ئێران دەرنەچووەو تەواو بووە.

ئەمە هەموی لەلایەك. بەڵام ئایا تەرمە پیرۆزەکەی چیی بەسەر هاتووەو لەکوێ نێژراوەو کەیو چۆن نێژراوە؟

خەبەرەکە نهێنییەو شۆڕش ئاشکرای نەکردووە، بەڵام ئەگەر وەفاتی سوار ئاغا راست بێ، کارەساتێکی ترەو توشی بنەماڵەی شێروانی بووە. سوار ئاغا کۆڵەکەی پشتی بابم بوو، بەڵکو بە شێری ئەم بنەماڵەیە حیساب دەکراو پیاوێکی زیرەكو سەخیو رەوشت بەرزو مەرد بوو.

---

[1] ئەو هەواڵەی کە بەجەوهەر مێرگەسۆری گەیشتووە راست نیە. مەسەلەکە بەمجۆرەیە: مینێك تەقیوەتەوەو هەواڵەکە وا رزیشتووە کەگوایە لەئەنجامی تەقینەوەی ئەو مینەدا مامەند سوار ئاغا کوژراوە. راستییەکەی ئەوەیە کە لەو رووداوەدا نە سوار ئاغا کوژراوە نە مامەندی کوڕی، بەڵکو ئەوەی کەکوژراوە کەسێکە بەناوی سەعید.

[2] نیگەرانیی جەوهەر مێرگەسۆری لەوەی ئەبا سوار ئاغا لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانی لەدەست دابێ، بەڵگەی ئەوەیەکە ئەشکەنجەدان لەبەندیخانەکانی رایاتو خەلان بەشێوەیەکی فراوان بەکار هێنراوە.

ئەگەر کارەسات هات، بەلافاو دێتو بەکەس ناگەڕێتەوە. بەر لەمانگو نیوێك، لەسەردەمی ڕۆیشتنی شێخ عوسمان بارزانی بۆ ناو حکومەت لەترسو رقی شۆڕش، مامەندی کوڕی سوار ئاغا لەگەڵ برایەکی تری سوار ئاغاو هەندێ خزمی تری لەگەڵ شێخ عوسمان بون. لەڕێگا بەسەر هەندێ لوغم دا دەچن، مامەندو[1] سەعید ناوێك دەکوژرێن.

خودای گەورە ڕەحمان پێ بکات. خۆ هێشتا جێگاو ڕێگاو چارەنوسی فاخری برامو سەعیدی برامو خەڵۆی پێشمەرگە دیار نیە[2]، جگە لەوەی سێ براو چەند ئامۆزایەکم هەر لەبەندیخانەی رایاتن. وا منو باوکی پیرو بێ تواناشم لەخەلان دەستبەسەرین.

دیسان دەڵێم هەر خودا ڕەحمان پێ بکات. شوکرین بە گەورەیی‌و ڕەحمو لوتفی بێ پایانی خودا.

**٢١ی تەموزی ١٩٧٤**

هێشتا شەڕ لەنێوان هێزە دابەزیوەکانی تورکیاو هێزە نیشتمانییەکانی یۆنانییە قوبرسییەکان بەردەوامە. بەڕاستی یۆنانییەکان لەقوبرس شەڕێکی پاڵەوانانە دەکەن. لەلایەکی ترەوە، تورکە قوبرسییەکان لەگەڵ سوپای تورکیا کەهەموو هەرێمی ئەوانی لەژێر چنگ دایە، لەدژی برا یۆنانییەکانیان شەڕ دەکەن. ئیستعمار دەزانێ چۆن دوبەرەکی لەنێوان نیشتمانپەروەرەکاندا بچێنێ[3].

ئەمڕۆ هێزێکی تری تورکیا گەیشتە قوبرس بۆ بەهێزکردنی سوپای خۆی

---

[1] وەك لەمەوبەر رونمان کردۆتەوە. هەواڵەکە بەهەڵە گەیشتۆتە لای جەوهەر. مامەند نەکوژراوە بەڵکو سەعید ناوێك کوژراوە.

[2] ئەمانە هەموویان گیرا بوونو چارەنوسیان دیار نەبوو.

[3] لەو سەردەمە وا باو بوو هەر چی کێشە هەیە لەجیهاندا، دەخرایە ملی ئیستعمارەوە. گوایە ئیستعمار دوبەرەکی لەنێوان گەلانو دەوڵەتان دەنێتەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی دابین بکات.

لەوێ. شەڕ لەجادەکانی نیقۆسیا زۆر گەرمەو کودەتاچییەکان تۆپی دژە ئاسمانیان لەسەربانی خانوو و ئوتێل‌و شوێنەکانی تری ناوشار داناوە بۆ لێدانی فڕۆکەکانی تورکیا. بەڵام فەرماندەی لەشکری داگیرکەری تورک ئینزاری پێ دان کەئەگەر تۆپە فڕۆکەشکێنەکان لەو شوێنانە لانەبەن، ناچار دەبن هەموو شار وێران بکەن. کودەتاچییەکان سەریان دانەواند بۆ ئەم هەڕەشەیە تۆپەکانیان لەو شوێنانە لابرد.

لەلایەکی ترەوە هەزاران ترومبێلی عەسکەری‌و تانکی یۆنانی لەسەر جادەی سەرەکیی نێوان تورکیاو یۆنان جموجوڵ دەکەن بۆ سەر سنورو یۆنان ئینزاری داوە کەئەگەر لە٤٨ سەعاتدا شەڕ رانەگیرێ، جەنگ لەدژی تورکیا رادەگەیەنێ.

ئەمڕۆ ٢٢ پارچە لەئوستولی شەشەمی ئەمریکا، سەرباری چەند فڕۆکەیەکی بارهەڵگر، بەبیانوی گواستنەوەی هاوولاتییە ئەمریکییەکان چوون بۆ قوبرس. روسیاش لەبەیاننامەیەکی تازەیدا دەڵێت دەبێ حکومەتی شەرعیی قوبرس بێتەوە سەر حوکم‌و کودەتاچییەکان لابدرێن‌و گوناح دەخاتە ئەستۆی یۆنانەوە، بەڵام ئیشارەت بەهێرشەکەی تورکیا بۆ سەر ئەو دورگە بچوکە نادا.

**٢٢ی تەموزی ١٩٧٤**

هێشتا شەڕێکی توندو خوێناوی لەنێوان هێزەکانی تورکیاو یۆنانییە قوبرسییەکان دەگەڕێ. شەڕی توند بەزۆری لەسەر فڕۆکەخانەی نیقۆسیایە. بەپێی دەنگوباس، فڕۆکەخانەکە کەوتۆتە چنگ هێزەکانی تورکیاوەو فڕۆکەکانیش ئێزگەی کودەتاچییەکان بۆمباران دەکەن. بەڵام یۆنانییە قوبرسییەکان لەئێزگەکەیان دەڵێن هێشتا بەندەری کرینیا لەژێر دەسەلاتی ئەوان دایەو تورکیا بەدرۆ دەخەنەوە کەگوتویەتی گوایە بەندەرەکەی داگیر کردووە.

هەروەها رادیۆی تورکیا رایگەیاند کەشەوی رابردوو ژمارەیەك کەشتیی جەنگیی یۆنان ویستویانە هەندێ هێزی سوپایی لەباشوری رۆژئاوای قوبرس دابەزێنن بەڵام کەشتییە شەڕکەرەکانی تورکیا بەرەنگاریان بونەتەوەو سێ چوارێکیان لێ ژێر ئاو کردووەو هەوڵەکەشیان بەشکست گەیاندووە. هەروەها گوایە کەشتییەکی تورکیا نوقم کراوە. ئەمشەویش هێزی تری چەتربازی تورك لەنیقۆسیا بۆ پشتگیری کردنی هێزەکانیان دابەزیوە.

دەنگوباسی ئەمڕۆی لەندەن دەڵێت: حکومەتەکانی یۆنانو تورکیا رەزامەندییان بۆ شەڕ راگرتن دەرخستووە، ئەویش لەسەر بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانو بەگوێرەی پرۆژەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا هنری کسنجەر. هەروەها جۆزیف سیسکۆ لەماوەی ئەو دوو رۆژەدا بەبێ وەستان ئەمسەرو ئەوسەری لەنێوان ئەنقەرەو ئەسینا کردووە.

ئەمشەویش هێزێکی یۆنانی دابەزیوەتە سەر دورگەی رۆدسی یۆنانی کەدوازدە میل لەمەرزی تورکیاوە دورە.

دوا دەنگوباسیش دەڵێ: لەسەر بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان پێویستە لەسەعات پێنجی ئێوارە شەڕ رابوەستێ. بەڵام بەر لەو کاتەی کەدیاری کراوە، شەڕ لەوپەڕی توندی دایە. یۆنانییە قوبرسییەکان لەچەند گەڕەکێکی تورکەکان کوشتارێکی زۆریان لەسێ چوار شوێنی مەدەنی کردووە.

فڕۆکەکانی تورکیا بەردەوامن لەسەر بۆردومان کردنی سەنگەرەکانی یۆنانییەکان. دەنگوباسیش وای پیشان داوە کەئەمڕۆ تزیکەی چواردە فڕۆکەی بارهەڵگری یۆنانی لەفڕۆکەخانەی نیقۆسیا نیشتونەتەوە بۆ بەهێزکردنو پشتگیری کردنی کودەتاچییەکان.

ئێستا سەعات شەشو نیوی ئێوارەیەو سەعاتو نیوێك بەسەر کاتی دیاریکراوی راگرتنی شەڕدا رەت بووە. بەڵام شەڕ هەر بەردەوامەو هەردولا

پەلاماری یەکتری دەدەن. ئینگلیزەکانیش بەردەوامن لەسەر دەربازکردنی هاوولاتییەکانیان‌و بردنیان بۆ دوو بنکە سوپاییەکەی خۆیان لەقوبرس. یۆنان تورکیا بەتێکدانی ئاگربڕ تۆمەتبار دەکا. تورکیاش تەنها یەك ئامانجی عەسکەریی هێناوەتە دی ئەویش داگیرکردنی ناوچەی تورکنشینی قوبرسە.

شکستی عەسکەریی تورکیا دەرکەوتووە چونکە بەم سوپا زۆرە نەیتوانیوە ئامانجەکانی دژی سوپایەکی بچوك‌و لاوازی وەك سوپای نیشتمانیی قوبرس بێنێتە دی‌و زیاتر لە١٧ فڕۆکەی خراوەتە خوارەوە.

دەنگوباسی شەو رایدەگەیەنێ کەکودەتایەك لەیۆنان رویداوەو لەشکری سێهەمی یۆنان ئەنجامی داوە دژی حکومەتە عەسکەرییەکەی یۆنان بەلام هێشتا ئەم هەواڵە تەئکید نەکراوەتەوە. بەهەر حاڵ، جولانەوەیەك لەیۆنان هەیە.

**٢٣ی تەموزی ١٩٧٤**

شەڕ کەم کەمە هەر هەیە لەقوبرس بەلام هەردولا یەکتری بەتێکدانی ئاگربڕ تاوانبار دەکەن. نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ جاری دوهەم تەئکیدی کردۆتە سەر شەڕ راگرتن بەزوترین کات.

ئەمڕۆ ئێوارە هەندێ گۆڕانی بنەڕەتی لەوەزعی یۆنان‌و قوبرس هاتە دی. حکومەتی عەسکەریی یۆنان دەستی لەحوکم هەڵگرت‌و دەسەلاتی بەحکومەتێکی مەدەنی دا. سەرۆکی یۆنان جیزیکس بەناوی یۆنانەوە بانگەوازێکی بەکۆنە سیاسەتمەداری یۆنان کەرەمانلیس دا کەبگەڕێتەوە بۆ یۆنان‌و سەرۆکایەتیی حکومەتی یۆنان بگرێتە ئەستۆی خۆی. ناوبراو یازدە ساڵە لەمەنفایە لەفەرەنسا.

هەر واش بوو. یەکسەر ناوبراو لەپاریسەوە جموجوڵی کردو لەئەسینا پێشوازییەکی گەرمی لێ کراو یەکسەر چووە کۆشکی کۆماری‌و دوای

دوازده سەعات سوێندی دەستوریی لەپێش سەرۆکی کۆمار خواردو حکومەتێکی مەدەنیی پێك هێنا. بەم کارە دەسەڵاتی عەسکەری لەیۆنان دوایی هات‌و قۆناغێکی تری دیموکراسی دەستی پێ کردەوە.

ئەمە لەیۆنان. بەڵام لەقوبرسیش هەمان گۆڕانکاری کرا. سەرۆکی بەزۆر خۆسەپێنەری تازە نیکۆلای سامسۆن لەحوکم لابردراو سەرۆکێکی تازە بەناوی کیریدسر بووە سەرۆکی کۆمار. ناوبراو یەکسەر لەگەڵ نوێنەری تورکەکان کۆ بۆوە بۆ دامەزراندنەوەی وەزع لەقوبرس. وەزعەکە زۆر هێمن بۆتەوە. هێزەکانی تورکیا جارێ هەر لەقوبرس دەمێننەوە تاکو وەزعی ئاشتی تەواو سەر دەگرێت.

٢٤ی تەموزی ١٩٧٤

هێشتا ناکۆکی‌و شەڕو تێکدانی ئاگربڕ لەنێوان هێزەکانی تورکیاو قوبرسییە یۆنانییەکان بەردەوامە. لەکاتێکدا گفتوگۆی سێقۆڵی لەنێوان نوێنەرانی تورکیاو یۆنان‌و ئینگلیز لەجنێڤ بەردەوامە بۆ دانانی چارەسەرێك بۆ کێشەی قوبرس، تورکیا دەیەوێ رژێم لەقوبرس فیدرالی بێت، واتە دورگەکەی قوبرس بکرێت بەدوو ناوچەی ئۆتۆنۆمی بۆ تورك‌و قوبرسییە یۆنانییەکان، بەڵام نوێنەری یۆنان بەم رایە قایل نیە. لەهەمان کاتدا هێزەکانی هەردولا روی چەك‌و تۆپیان لەیەکتری کردووە.

شایانی باسە کە٣٠ هەزار سەربازی تورکیاو ٢٥٠ تانك لەسەر خاکی قوبرسن. رێژەی تانکەکانی تورکیا بۆ هێزە نیشتمانییەکانی قوبرسییە یۆنانییەکان یەك بەدەیە، کەچی بەم هێزە زۆرەی تورکیا نەیتوانیوە بەتەواوی دەست بەسەر شوێنی گرنگی ئەم دورگەیەدا بگرێت.

دەتوانم بڵێم تورکیا لەڕوی ستراتیجی عەسکەرییەوە لەم داگیرکردنەیدا سەرکەوتوو نەبوە، هەرچەند لەڕوی تاکتیك‌و ستراتیجەوە زۆر ئامانجیشی بەجێ گەیاندووە.

**٢٥ی تەموزی ١٩٧٤**

لەدوای هێرشەکەی حکومەت بۆ سەر ناوچەی هێزی سەفینو بێتواتە لەشەوی ٢٩/ ٣٠ی حوزەیرانەوە تاکو ٣- ٤ی تەموز، دوژمن جموجوڵی لەشەڕی مەزندا وەستاندووە. ئێستا لەهیچ شوێنێك شەڕی زل نیە، تەنها شەڕی مەفرەزەو ئەلغامو پەلاماری تەسكو سنوردار بۆ سەر هەندێ ڕەبیە هەیەو لەتۆپباران زیاتر چیتر لەگۆڕێ نیە.

پێشبینیێ دەکەم ئەو بێدەنگییە بەردەوام نەبێو دوژمن هێرشێکی تر بۆ سەر شوێنێکی تر بکات. دوریش نیە هێرشی ئەمجارە بۆ سەر ناوچەی پیرسو بلەو بارزان بێت، ئەویش بەپشتگیریی گروپەکەی شێخ عوسمان.

**٢٧ی تەموزی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ دەمەو عەسرێکی درەنگ لەماڵەوە چوم بۆ حجزگاکەمان. باوکم لەبەر دەرگا لەسەر کورسی دانیشتبوو. لەدورەوە چاوم بەپیاوێك کەوت خۆی بەترومبێلە مارسیدسە مۆدێل کۆنەکەوە هەڵواسی بوو. دوای ئەوەی باش لێی هورد بومەوە، عەرزی باوکم کرد کەئەو پیاوە هەر لەخولە گەرمیانی دەکات. باوکم هەستار سەیری کرد، فەرموی راستە لەو دەکات.

بەرەو لای چوم. ئەو پیاوە بەوەفاو باشە هەر لەدورەوە بەهەردوو دەست دای بەسەری خۆیو بەدوو چاوی پڕ فرمێسکەوە بەرەو پێشم هاتو تێروپڕ دەستی ماچ کردم، منیش تێر تێر چاوم ماچ کرد. پرسیاری وەزعی ئێمەی لێ کردم. پێم گوت باوکیشم تەشریفی لێرەیە. هەر بەڕاکردن کەوتە شوێنم. هەرچەند قەدەغە بوو هیچ کەسێك بەبێ ئاگاداریی فەرماندەی پاسەوانەکان بێتە لامان، بەڵام خولە گەرمیانی حیسابی ئەوەی نەکردو بەدڵێکی پەرۆشەوە رایکردە لای باوکمو کەوتە دەست ماچ کردنی. باوکیشم وەکو کوڕێکی خۆی چاوی ماچ کرد.

خولە گەرمیانی کە سەری بەرز کردەوە، بینیم فرمێسك بەگوڕ لەهەردوو

چاوی لێژ بۆتەوە. بەتەنیشت باوکمەوە دانیشت، دەستەسڕەکەی دەرکردو کەوتە گریانێکی کپو بێدەنگو چاوەکانی سڕییەوە ئینجا بەدوو چاوی سورهەڵگەڕاوەوە رووی تێ کردینو پڕ بەدڵ گوتی "ئێستا مردنم حەقە. مادام ئێوەم دیت، ئیتر با بمرم سووم لەخۆم نیە".

**٢٨ی تەموزی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ بەیانی ویستم نامەیەك بنوسمو بەهۆی خولە گەرمیانییەوە بینێرم بۆ کرماشان بۆ خاڵۆکانی غاندیو نەنکی. دایکی غاندیش نامەی نوسی بوو بەڵام بەر لەوەی من نامەکە بنوسم، میوانەکانی ماڵی شێخ عەبدوڵلای خەلان هەڵسان. خولە کەشوفێری ترومبێلەکە بوو ناچار بوو هەڵسێ، بەئومێدی ئێوارە بگەڕێتەوە.

بەر لەدوو رۆژ دایکی غاندی لەناکاو گوتی ئەمڕۆ یان سبەینێ میوانمان لەئێرانەوە دێ. سەیر ئەوە بوو ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ کتوپڕ خەلیل، خاڵۆی غاندی، هاتە ژوورەوە. ئیتر پێویستمان بەخولە نەما. هاتبوە شوێن دایکی غاندی تا بیباتەوە چونکە ئامۆزایەکیان بەناوی ساڵح حەمید لەبەغدا بەدەستی بەعسییەکان ئیعدام کرابوو. ماوەی سێ مانگە، تا ئێستا هەموو عەشیرەتی تایشەیی بەهۆی ئەمەوە رەشپۆشە.

ئێوارە نامەیەکم بۆ محەمەد عەزیز لەناوپردان نوسی تا دەستور بدەن منداڵەکانم بنێرمەوە. خەلیل چاوی بەمحەمەد عەزیز کەوتبوو، بەڵێنی لێ وەرگرتبوو کەرۆژی دواتر بچێتەوە لای تاکو وەڵامەکەی لێ وەرگرێ دوای ئەوەی محەمەد عەزیز پرس بەبارەگای بارزانی دەکات.

شایانی باسە ماوەی سێ مانگە داوای ئیجازە بۆ منداڵەکانم دەکەم کەچی تا ئێستا رێگایان نەداوە. هیوادارم ئەمجارە هەڵوێستیان بگۆڕن. سەر لەئێوارە خەلیل گەڕایەوە، محەمەد عەزیز گوتبوی با بەیانی سەرێکی تری لێ بداتەوە.

۲۹ی تەموزی ۱۹۷٤

ئەمڕۆ سەر لەبەیانی، سەعات حەفت، دوو فڕۆکەی میگ هاتنە سەر ناوچەی بەرزێوە. تۆپە فڕۆکەشکێنەکان بەرەنگاریان بونەوەو توانییان یەکێکیان بخەنە خوارەوە کەجۆری میگ ۱۹ بوو. فڕۆکەوانەکەش کە ناوی هاشم قەدۆ بوو لەناو فڕۆکەکە مردبوو.

فڕۆکەکە سەر بەسربی ۱۹ی فڕۆکەخانەی موسل بوو. حکومەت هەوڵیداوە بەهۆی فڕۆکەی جەنگیو ۳ هەلیکۆپتەری زرێپۆش سەرباز دابەزێنێتە شوێنی کەوتنی فڕۆکەکە لەنزیك خەلەکان بۆ رزگارکردنی فڕۆکەوانەکە بەلام هەوڵدانەکەی سەر نەکەوتووە چونکە شوفێرەکە مردبوو. فڕۆکەکان توانییان ٤- ٥ پێشمەرگە کەچووبونە سەر تەرمی فڕۆکەوانەکە بریندار بکەن، یەکێکیان برینەکەی سەختە. ئەوانی تر پێویستیان بەدەرمانو نەخۆشخانە نیە.

ئەمڕۆش خەلیلم ناردەوە لای محەمەد عەزیز، ئەویش لەسەر بەڵێنی خۆی. بەلام شەو داهاتو خەلیل نەهاتەوە. کەمێك دڵم ناڕەحەتە. دور نیە خەلیل شەو بچێتەوە بۆ ماڵەکەی لەچۆمان، بۆیە نەگەڕاوەتەوە.

۳۰ی تەموزی ۱۹۷٤

ئەمڕۆ عەسرێکی درەنگ خەلیل گەڕایەوە. شەو لەچۆمان لەماڵی کاك فاخرو ئەوان بوو. محەمەد عەزیزی دی بوو، پێی گوتبوو ئەگەر بزانیت ئیجازە دەدەن پێم بڵێ، ئەگەر ناشبێ با بڕۆمەوە. ئەویش لەوەڵامدا گوتبوی: "ئەڕۆیتەوە، ئومێد هەیە ببێو من خۆم حەز دەکەم ئەم شتە جێبەجێ بکەم بەلام یەك دوو گرێ ماوە، ئەوانیش چارە دەکەم. تۆ سەرم لێ مەبڕەو بیرەوە لام".

ئایا ئیزن دانی ئافرەتێکی سادەو ساکار کەدەیەوێ بچێتە ماڵی باوکی لەئێران، چ گرێو کۆسپی تێدایە؟ خۆ هەموو رۆژ سەدان خێزان

بەترومبێل لەمەرز ئاوای ئەودیو دەبن و زنجیرەی خەڵك بەهیچ جۆر لەسنور نابڕێتەوە، کەچی ئەمە بۆ ئێمە کارێکی زۆر سەختە!

* * *

ئەمڕۆ زانیاریی تر لەئێزگەی کوردستان خوێندرایەوە گوایە فڕۆکەوانەکە مولازم ئەوەل بووە.

* * *

ئەمشەو سەعات ٨ لەئێزگەو تەلەفزیۆن راگەیەنراوێك ئاشکر کرا تێیدا ناوی ٦٠ کەس خوێندرایەوە کەدەبنە ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانانی ئۆتۆنۆمی. خۆ دەبوو ٨٠ کەس بونایە، بەڵام بەغدا ئاشکرای کردووە کەناوی بیستەکەی تریش لەکاتێکی تر بڵاو دەکرێتەوە چونکە هەندێ لەهاوولاتییەکان لە هەلومەرجی وادا نین کەبتوانن ئێستا ئەم دەورە ببینن. واتە حکومەتی بەغدا بەنیازی ئەوەیە خەڵك لەشۆڕش رابکەن و بن بەجاش.

### ٣١ی تەموزی ١٩٧٤

ئەمڕۆش نامەیەکی ترم بۆ محەمەد عەزیز نوسی کەمێك توندو بەگلەیی بوو بەڵام بەمەسڵەحەتم نەزانیی و دڕاندم، نامەیەکی تری نەرمم نوسی.

لەبەر ئەوەی خەلیل لەم هاتوچۆیە بێ تاقەت ببوو، نامەکەم بەپاسەوانێکی خۆمان، لەو پاسەوانانەی لەبەر رۆتینیاتی کاربەدەستانمان لەسەر خۆمان دانراون و چاودێریمان دەکەن، نارد. بەپاسەوانەکەم گوت بیدەرە دەست خۆی ئەگینا شەویش وەڵامت نادرێتەوە. پاسەوانەکە ناوی حاجی سەعید سەلامە، پیاوێکی باش و خواپەرستە، سەردانی ماڵی خوداشی کردووە. نامەکەی، پیاوانە، بردبوو. بەهەر حاڵ، گەیاندبویە دەست خۆی لەناو جەنجاڵی خەلکی ساحب کاردا، وەڵامەکەشی لێ وەرگرتبوو کەئەمە دەقەکەیەتی:

برای بەڕێز کاک جەوهەر
سڵاوو ئیحترام
کاکە مەبدەئیەن موافەقەت هەیە بەڵام پێویستم بەپرسیارێکی کاک مەسعود هەیە. مومکینە ئەمشەو یان سبەی شەو دەستم بیگاتێ. خەبەرتان دەدەمێ.
ئیتر خۆشیتان.
محەمەد عەزیز

٢ی ئابی ١٩٧٤

ئەمڕۆ منو خەلیلو فازلی فەرماندەی پاسەوانەکانی ئێمە لەگەڵ پێشمەرگەیەك چوین بۆ ئازادی بۆ سەردانی بێستانەکەم. لەوێشەوە خەلیلو پێشمەرگەیەکم بۆ ناوپردان نارد بۆ لای محەمەد عەزیز. ئێمەش هەندێ پیوازمان هەلکەندو گەڕاینەوە بۆ خەلان.
سەر لەئێوارە، خەلیل درەنگ گەڕایەوە. چاوی بەمحەمەد عەزیز کەوتبوو کە گوتبوی "موافەقەت کراوەو ئومێد هەیە ئەمشەو کۆتایی بێت. بۆیە شەو وەرە لام لەبارەگای ئیدریسو مەسعود لەنزیك گوندی خەلان".
شەو سەعات ٨,٣٠ فازلی فەرماندەی پاسەوانەکانم لەگەڵ خەلیل نارد تا بچنە شوێنی دیاریکراو. دەوری سەعات دەی شەو خەلیل گەڕایەوە. من پاڵ کەوتبوم. بەر لەهەموو شتێك لێم پرسی:
-ها، خەلیل. شێری یان رێوی؟
خەلیل بەعاجزییەوە گوتی:
-بەخوا لەرێویش خراپترم.
پێم گوت: چی وت؟ ئەویش گوتی: دوای چەندین دانیشتن، ئەوجا تازە بەشوێن پیاوێکدا بەناوی شیلمۆن دەگەڕا تا ئەو بەمەسعود بڵێت.
ناونیشانێکی بێ ماناو بێ خێریشیان بەخەلیل دابوو. بەهەر حاڵ، وا

دیاره محەمەد عەزیزو ئەوان نیازیان نیە نیجازە بەمنداڵەکانم بدەن وەك ئەوەی ئەم ئافرەتە ببێتە هۆی گۆڕانێك لەم جیهانەدا!!؟
بەیانی، خەلیل بەدوای ئەو کەسەدا دەچێت بۆ حاجی ئۆمەران.

**٣ی ئابی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ، بەر لەنیوەڕۆ، منو خەلیل لەمشتومڕی کێشەی خۆماندا بوین. خەلیل چوە دەرێو لەبەر دەرگای بارەگای ئێمە (حیجزگاکە) دانیشت. باوکیشم لەگەڵ حەمە رەسول دامای دەکرد. منیش کەمێك پاڵ کەوتم. یەکسەر خەلیل هاتە ماڵەوەو گوتی باوکم هات.
هەڵسامەوە، دیتم خاڵۆ کەریمی باوکی خەلیل خەریکی پێڵاو داکەندن بوو. تێر تێر یەکترمان ماچ کرد. ئەویش بەدوای خەلیل هاتبوو بۆ ئەوەی زوو بگەڕێتەوە. ئەوان وایان زانی بوو من بەتەواوی گیراوم. بەلام کەمنیان دیتو زانییان گیرانەکە بەو جۆرە نیەو کەمێك ئازادم، تەواو کەیف خۆش بوون.
هاتنی کوێخا کەریم زۆر باشە چونکە بەهێزکردنی مەوقیفە بۆ مەسەلەکەی ئێمەو نیجازەکە. کوێخا کەریم ئەم لاو ئەولا نازانێ. تا کۆتایی پێ نەهێنێ، واز لەمحەمەد عەزیز ناهێنێ.
ئەمشەو دەچێت بۆ لای. منیش کاغەزێکی توندوتیژم بۆ محەمەد عەزیز نوسیوە. لام وایە کەمێك گوێچکەی سور دەبێتەوەو عاجز دەبێت.

**٤ی ئابی ١٩٧٤**

دوێنێ شەو کوێخا کەریم و خەلیل گەڕانەوە، بەلام پەستو غەمبار دەهاتنە بەرچاو. وا دیار بوو هیچیان بۆ نەکراوە. منیش لەگەڵ ئەوان تا بەیانی لەسەر جێگا خوێ خوارد. ئەوان کەچوو بوون بۆ لای محەمەد عەزیزو عەرزیان کردبوو، محەمەد عەزیز نەیزانی بوو چ وەلامێکیان بداتەوە چونکە

ئەو ئەركی سەر شانی خۆی بەجێ گەیاندبوو و هەموو شتێك كۆتایی هاتبوو تەنها لەشوێنێك گیر بوو. بۆیە محەمەد عەزیز نەیدەزانی چی بڵێ.

بەڵام بۆ ئێوارە كەخەلیلم نارده حاجی ئۆمەران بۆ بارەگای جیهاد ئیسماعیل و شلیمۆن، ئەم بابەتە رون بۆوە. جیهاد بەخەلیلی گوتبوو من بەشلیمۆنم گوتوەو تۆ بچۆ بۆ لای. ئەویش چوو بوو بۆ لای. شلیمۆن یەكسەر تەلەفۆنی هەلگرتبوو قسەی لەگەڵ مەسعود بارزانی كردبوو. مەسعود بەشلیمۆنی گوتبوو: "مەسەلەكەی كاك جەوهەر لەزووەوە تەواو بووەو رەزامەندی نیشان دراوە. چۆن تا ئێستا ئاگادار نەكراوەتەوە؟ من بەعەبدولوهەیمنم گوتوە ئەوەی كەپێویستە جێبەجێی بكات".

لێرەدا دەركەوت عەبدولوهەیمنی كوڕی شێخ سلێمان بارزانی كەئەویش هەر لەبارەگای بارزانی كار دەكات، هۆی ئەم دواكەوتنەیە.

لەدواییدا جیهاد ئاگاداری خەلیلی كرد بوو كەشەو بچێتە بارەگای ئیدریس‌و مەسعود لەنزیك خەلان، ئەوانەی كەپەیوەندییان بەبابەتەكەوە هەیە لەوێن.

شەو خەلیل چوو بووە لای محەمەد عەزیز، دی بوی. بەخەلیلی گوتبوو: ها ئەمە هەندێ مەسرەف بۆ جەوهەر بەرە، بەیانیش وەرە ناوپردان تاكو پسولەی رەت بونتان لەسنور بدەمێ.

شەو خەلیل هاتەوە ٣٠ دیناری بۆ مەسرەف وەرگرتبوو. بەڕاستی وەخت بوو لەرقان شەق بەرم. سی دیناری بۆ مەسرەف ناردووە، لەكاتێكدا دەزانێ چەند مانگ لەئێران دەمێنێتەوە، نەساغەو پێویستی‌و خەرجیی رێگا زۆری دەوێ. بەگشتی، كاكم سی دیناری فەرمووە. دەك لەكیسەتان بەزیاد نەبێ و سەرتان بخوا. خۆ خەربەندەیەك، بۆ رابواردن، دوای ماندوبون لەخزمەت كردنی ئێستر، ئەگەر بچێتە ئێران، بەبێ خۆ خوراندن، سەد یان سەدو پەنجا دیناری دەدەنێ‌و داوای لێبوردنیشی لێ دەكەن كەعەفوومان بكا كەمە. كەچی من ئەم هەموو خزمەتەم كردووە، برا گیان بەهەموو

قوەتی خۆی سی دینار کەرەم دەکات.

لەڕقان نامەیەکی توندوتیژم بۆ نوسیو ٣٠ دینارەکەشم بۆ خستە ناو. بۆم نوسیوە: زۆر مەمنونم لەو زەحمەتەی کێشاوتانەو ئەم خەرجییەی کەرەمتان کردبوو، بگێڕینەوە بۆ شوێنی خۆی.

هەر ئەمشەو سەعات ١٠ فڕۆکەیەکی باجەڕو دوو سیخۆ هاتنە سەر ناوچەی باڵەك: تەنها لەگوندی ئۆمەراوە شەش کەسیان کوشت: کوڕێكو دایکیو خوشکی، لەگەڵ سێ کەسی تر. سێزدەش بریندارن لەوانە کچێکی بچوکی مامۆستا ئەنوەر، هەمان شەو لەگەلاڵەش فڕۆکەکان پیاوێکیان کوشتبوو.

### ٥ی ئابی ١٩٧٤

دوژمن بەسوپاو جاش لەخەلیفان و سپیلك کۆ بۆتەوە. گومان دەکرێت نیازی هێرشی هەبێ بۆ لای ڕەواندزو دیانا. پێشمەرگە کەوتە خۆیو هێزی بەرەو رویان نارد. هەروەها پێشمەرگەی ڕەسمی و بەرگریی میللی[1] بەترومبێل دابەزی بۆ خوارەوە بۆ لای ڕەواندزو گەلی عەلی بەگ.

هەروەها تۆپێکی زۆر زۆر گەورەش براوەتە خوارەوە. تا ئەمڕۆ هەر تەدریبیان لەسەر دەکرد[2].

---

[1] بەرگریی میللی ئەو کەسانەن کە بەشێوەیەکی فەرمی پێشمەرگە نەبون بەڵام چەکدار بوونو لەکاتی هێرشی دوژمن بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکان بەتەنیشت پێشمەرگەوە شەڕیان دەکردو ناوچەکانیان دەپاراست. ئەم هێزە ڕۆڵێکی گەورەی لەبەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی دوژمندا گێڕاوە.

[2] ئەم تۆپە لەو تۆپانەیە کەپاش پێشڕەویی سوپای عیراق. ڕژێمی شای ئێران لەسەر داوای مەلا مستەفا بارزانی. بەشۆڕشی داوە، چونکە ناوچەی حاجی ئۆمەران کەبارەگای سەرکردایەتیی شۆڕشی لێ بوو، هەڕەشەی گرتنی لەسەر بوو و هەموو شیکردنەوەکان رایان وابوو کەئەگەر شا فریای بارزانی نەکەوێ، سوپای عیراق دەگاتە حاجی ئۆمەرانو دەستی بەسەردا دەگرێ.

ئەمڕۆ شوکر بۆ خوداو هەزار شوکر بۆ خودا دوای سێ مانگ کێشەی ئیجازەی ئافرەتێك کەدەیویست بچێتەوە بۆ ماڵی باوکی، تەواو بوو. ئافەرین بۆ کاربەدەستانی شۆڕشەکەمان. سەد ئافەرین.

هەڵبەت سەر لەئێوارە خەلیل چوو بوو بۆ ئاوپردان، نامەکەی منی دابوو بەمحەمەد عەزیز. بەلاّم بەداخەوە پسولّەی چاپکراوی نەبوو. بۆیە دیسان بەخەلیلی گوتبوو شەو بێرەوە لام لەشوێنی شەوانی پێشوو، بەلکو لەم لاو ئەو لا پسولّەیەك پەیدا بکەم. بەهەر حاڵ، شەو خەلیل چووە لای‌و هاتەوە. ئەمجارە دونیا خراپ بووە. کێو بەری هاوێشت‌و فەرخەی بوو. فەرخەش پسولّەیەکی چاپکراو بوو.

### ٦ی ئابی ١٩٧٤

ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ ناردم ترومبیلێکمان بۆ هات. شتومەکی نۆغرچییەکانمان خستە ناو ترومبێل کەبریتی بوون لەدوو جانتا کەلوپەلی زل، ساج‌و پەرەمێزێك‌و شتومەکی پێویست بۆ غاندی.

دوای گرتنی چەند رسمێکی غاندیی بچکۆلاتەکەم لەگەڵ خاڵ‌و باپیرو دایکی‌و خۆیشم، کەوتنە رێ بۆ ئێران بەئومێدی ئەوەی پێش سەعات پێنج‌و نیو بگەنە مەهاباد، چونکە یەکەم سرویسی ئێران پەیما[1] سەعات ٥,٣٠ دەکەوێتە رێ بۆ کرماشان. ئەوان رۆیشتن‌و منیش خەوتم. سەیر ئەوە بوو سەعات پێنج لەجیاتی ئەوەی بگەنە سابلاخ، ترومبێلەکەیان لەبەر دەرگای ماڵ برێگی کردو دابەزین. هەر لەپەنجەرەوە بانگم کردن. خێرە، بۆ گەڕانەوە؟ گەڕانەوە لەبەر ئەوەی گوایە دوای دەوام قەدەغەیە هیچ کەسێك لەمەرز ئاودیو بێت. تا نزیك تەمرچیان چوو بوون کەبنکەی پۆلیسی ئێرانە.

دەی خێری تێدایە. بەخێر بێنەوە با بۆ بەیانی بێت. ئینشاللاّ خێری

[1] سەرویسی ئێران پەیما پاسی گواستنەوەی ئێران شارەکانی ئێرانە لەو سەردەمەدا.

تێدایه.

**٧ی ئابی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ سەعات ٥ی بەیانی، هەمومان لەخەو هەڵساین، جلمان گۆڕیو قاوەڵتیی بەیانیمان کرد. هەندێ پەنیرو ماستی مانگاکەی خۆمان خوارد.

سەعات٧,١٥ هەمان ترومبێل کەدوێنێ ئێوارە پێی هاتنەوە، لەبەر دەرگای حەسار وەستاو شوفێرەکەی ناوێ عەبدوڵلا بوو.

لەدوێنێوە معامەلەیان لەگەڵ شوفێرەکە کردبوو کەبەیانی بێتەوە دوویانو تا مەهابادیان ببات، لەگەڵ کرێی دوێنێیش کە لەحاجی ئۆمەرانەوە هێنابوونیەوە، گشتی پێنج دینار بدەن. باشە. هەرزانە.

دیسان سوار بونەوە بەڵام پڕ ئومێدتر لەدوێنێ. لەلای ترومبێل جارێکی تر غاندیی بچوکم ماچ کردو بەڕێم کردنەوە. خودایان لەگەڵ بێ، بەساغو سەلامەتی بگەنە جێ. شایانی باسە دوو نامەم لەگەڵیان نارد. یەکێکیان بۆ خێڵی داوود بەگی جاف لەتاران، ئەوی تریشیان بۆ شێخ عوسمانی بیارە لەنزیك دڕوی سنە. هەردوکیان لەبارەی کێشەی ئێمەوە بوو.

**٨ی ئابی ١٩٧٤**

١-کێشەی وۆتەرگێت لەئەمریکا گەیشتۆتە ئەوپەڕی توندیو سامناکی لەدژی سەرۆکی ئەمریکا نیکسۆن. نزیکەی ساڵێك زیاترە کێشەی وۆتەرگێت سەری هەڵداوە. شایانی باسە کە لەکاتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی ئەمریکادا بەر لەدوو ساڵ، نیکسۆن خۆی هەڵبژارد. بۆ ئەوەی پارتی جمهوری لەهەڵبژاردن دژی پارتی دیموکراتیك سەرکەوێ، لەهوتێڵی وۆتەرگێت چەند کارێکی پێچەوانەی سیستمی دەستوریی ئەمریکای کرد، لەوانە دانانی ڕێکخراوێکی تایبەت بۆ پەلاماردانی شوێنی گرنگی وەك بانقو خەرج کردنی ئەو پارەیەی کەهەیە بۆ بەرتیلو پەلاماردانی ناوچەکانی سەر بەپارتی دیموکراتیکو کڕینی خەڵك. لەوەش

زیاتر، ئەو باجەشی کە لەسەری بوو، نەیدابوو بەدەوڵەت. ئیتر کەم کەمە ئەم شتانەیان لەسەر زیندوو کردەوەو ئاشکرایان کرد. ئیتر بەڵگەکان دەرکەوتن، لەوانە زیاتر لە ٦٠ کاسێتی تۆمارکراو سەبارەت بەچۆنێتیی دانانی ئەو هەموو پیلان‌و کردەوانە بەدەنگی خۆی کەتێیدا خۆی سەرپەرشتیی تاقمەکەی دەکات.

دوای بردنەوەی هەڵبژاردن بۆ جاری دووەم لەساڵی ١٩٧٢، ئەم بابەتەش هاتە ئاراوەو بەرە بەرە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە خەریکی بوو تا هەموو شتێك ئاشکرا بوو. ئینجا ئەمساڵ داوا لەنیکسۆن کرا کەکاسێتەکە بدا بەو لیژنەیە بەڵام ئەو رەتی کردەوە، بگرەو بەردە چەند مانگێکی خایاند بەڵام هەڵوێستی کۆنگرێس زۆر بەهێز بوو، ئەویش تا ئەم دواییە کەنزیکەی حەوت کەس لەپارتی جمهوری لەگەڵ پەرلەمانتارانی پارتی دیموکراتیکی بەرهەڵستکار داوای دەستلەکار کێشانەوەی نیکسۆنیان کردو داواشیان کرد کاسێتەکە تەسلیم بکات.

ناچار، نزیکەی ٦٠ کاسێت لەکۆشکی سپی تەسلیم بەلیژنەی لێکۆڵینەوە کرا. هەرچەند لەزۆر شوێن کاسێتەکە سڕابونەوە بەڵام ئەوی تر بەس بوو بۆ تاوانبارکردنی نیکسۆن.

لەسەر ئەم بنچینەیە، دادگایەکی بەرز لەپەرلەمانتارانی کۆنگرێسی ئەمریکا بۆ دادگایی کردنی دانرا. هەرچەند نیکسۆن هەوڵی دەدا حەسانەت بۆ دەسەڵاتی سەرۆکایەتی دروست بکات کەبەرزتر بێت لەوەی کەسەرۆکی کۆمار دادگایی بکرێت بەڵام نەیتوانی‌و یاسا رێگای دا.

ئێستا نیکسۆن لەوپەڕی شپرزەیی دایە. هەرچەند زۆر پێ دادەگرێ‌و بەرگری لەخۆی دەکات و دەڵێ واز ناهێنم‌و کۆڵ نادەم‌و هەرچەند دەڵێ ئامادەم بچمە پێش دادگا گوایە سەرکەوتوو دەبێ‌و تاوانبار نیە، بەڵام ئەم هەموو هەوڵدانە بەبادا چوو (بەتایبەتی پاش ئەوەی کە) دە کەسی تر لەنزیکترین باڵی لایەنگری خۆی داوایان کرد دەست لەکار بکێشێتەوە.

بەمە پەڕو باڵی شکا. بەڵام تا ئەمڕۆ هەر ماوە. دادگا بەتوندیو بەبێ تەساهول داوای لێ کردووە دەست لەکار بکێشێتەوە یان بەدەرکردن دەردەکرێت.

ئینجا لێرەدا جیاوازی لەنێوان دەستلەکار کێشانەوەو دەرکردن بەنیسبەت سەرۆکی کۆمار چیە؟

ئەگەر دەست لەکار نەکێشێتەوەو بدرێتە دادگاو تاوانبار بکرێت، یەکەم، لەسەرەك کۆماری دەردەکرێتو دوهەم، زیندانیش دەکرێت، سێهەم، موچەی ساڵانەی کەهەشتا هەزار دۆلارە دەبڕدرێ، سەرباری بڕینی سەرمووچەی ساڵانە کەچل هەزار دۆلارەو چوارەم، موچەی خانەنشینیی دەبڕدرێت، پێنجەم، ژنەکەشی لەکاتی مردنی نیکسۆن موچەی خانەنشینیی بۆ سەرف ناکرێت، جگە لەوەی کەموچەی ئێستای کەوەك ژنی سەرۆکی کۆمار وەری دەگرێو چل هەزار دۆلارە، ئەویشی لێ دەبڕدرێ. شەشەم، نیکسۆن مافی ئەوەی نامێنێ کاری پارێزەری بۆ خۆی بکات هەرچەند پارێزەریشە. حەوتەم، ئیمتیازاتی تر کە بەسەرۆکی کۆماری وەلاکەوتوو دەدرێت، ئەویشی نامێنێ. بەکورتی، شاپێکی لێ دەدرێو بەرەڵای کۆلان دەکرێ.

بەڵام ئەگەر بێتو دەست لەکار بکێشێتەوە، دادگایی لەسەر لادەکەوێتو وەك سەرەك کۆمارێکی دەستلەکارکێشاوە سەیر دەکرێو ئەو هەموو ئیمتیازەی باسم کرد بۆی دەمێنێتەوە.

ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ دەنگوباس ئاشکرای کرد کەنیکسۆن ناچار بووە بەڵگەی دەستلەکارکێشانەوەی پێشکەش کردووەو خەریکی کۆبونەوەیە لەگەڵ وەزیری دەرەوە پرۆفیسۆر هنری کسنجەر چونکە سیستمی ئەمریکا دەڵێ لەکاتی دەستلەکارکێشانەوەی سەرەك کۆماردا دەبێ بەڵگەی دەستلەکارکێشانەوەکە پێشکەش بەوەزیری دەرەوە بکرێ، ئەویش بەنۆرەی خۆی دەیدات بەکۆنگرێس.

ئێستا جێگری نیکسۆن، جیرالد فۆرد، خەریکی وەرگرتنی کاروباری سەرۆکایەتییەو مەشغوڵە بەدیاریکردنی پیاوەکانی خۆی بۆ دەوڵەتو دانانی جێگرێك بۆ خۆی. لەوانەی کەداوای پۆستی جێگری سەرۆك دەکەن، وەزیری پێشووی بەرگری جەنرال میلڤن لێردە. قەول وایە سبەی نیکسۆن وتاری دەستلەکارکێشانەوە لەڕادیۆ رابگەیەنێو بەسکرتێری خۆی گوتووە وتارەکەی بۆ بنوسێت.

٢-ئەمڕۆ دەنگوباس هەیە کەدوێنێ دوژمن پێشڕەویی بۆ لای چوارقورنەو رانیە کردووە. هەروەها بەگوێرەی دەنگوباسی دوێنێ شەوی ئێزگەی "دەنگی کوردستان" گوایە دوو تیپی سوپا هاتون بۆ ناوچەی هەریرو باتاسو سپیلكو خەلیفان و نیازی هێرشیان هەیە.

تۆپەکانی شۆڕش لەپێرێوە سەربازگەکانی خەلیفان و سپیلكو هەریرو باتاسو ئاموکاو سەری کۆڕەك و گۆڕەزو شوێنانی تر بۆردومان دەکەن بۆ تێکدانی پلانی هێرش.

ئەمڕۆ کەپێنج شەممەیە بەجارێك دوکەڵو تەموموژ بەری ئاسمانی گرتەوەو لەخەلانەوە بەدووربینیش چیای کاروخ باش دیار نیە. لەشەوەوە دەنگی تۆپی قورس بە بەردەوامی دێتو فڕۆکەش لەسەر بەرەکان دەسوڕێتەوە.

دەنگوباسی سەعات ٨,٥ی ئەمشەوی ئێزگەی "دەنگی کوردستان" وای راگەیاندوە کەدوژمن بەسوپاو جاشەوە لەچیای کۆڕەکەوە بەرەو دارەهیشك کەهەر لەچیای کۆڕەکە هێرشی کردووەو بەتالیۆنی ٣و هێزی باڵەك بەرەنگاری بونەتەوەو زیانێکی زۆریان لێداوە. شەڕ تا دەوروبەری سەعات ٢ی نیوەڕۆ هەر بەردەوام بووە.

فەرماندەی بەتالیۆنی ٤ کاك عیززەت سلێمان بەگ دەرگەڵەییەو فەرماندەی بەتالیۆنی ٣ مەلا ئەمین بارزانییە.

٩ی ئابی ١٩٧٤

١-ئەمڕۆ مستەر نیکسۆن سەرۆکی ئەمریکا لەوتارێکی گرنگ‌و مێژووییدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لەسەرۆکایەتیی ئەمریکا ڕاگەیاند.

ئەم دەستلەکار کێشانەوەیە بەزۆرەملێ بوو کە لەئەنجامی فەزیحەتی ووتەرگێتدا کەدەستی نیکسۆنی تێدا بووە، بەسەریدا سەپێنراوە. هەر لەئەنجامی ئەو فەزیحەتەشە کە بەر لەهەشت مانگ جێگری پێشوی نیکسۆن مستەر سپیرۆ ئەگنیو بەزۆرەملێ ئیستیقالەی پێ کرا. نیکسۆن وای زانی بوو ئەگنیو بوو بەقوربانی ئەوو خۆی رزگاری دەبێت بەلاّم قانون ئەویشی راوناو تا ئەمڕۆ لەبەر دەستی قانون دەرنەچوو، ناچار بەسەرشۆڕییەوە دەستلەکارکێشانەوەی پێشکەش کردو کارکەنار بوو. ئەمڕۆ نیوەڕۆ دەستلەکارکێشانەوەکەی جێبەجێ دەکرێ‌و جێگرەکەی، مستەر جیرالد فۆرد، سوێندی یاسایی دەخواو بەڕەسمی بەسەرەك کۆمار دەناسرێت.

لەهەموی سەیرتر، مستەر نیکسۆن کەناچار کراوە دەست لەکار بکێشێتەوەو دەستلەکارکێشانەوەکەش بەزۆر بەسەریدا سەپێنراوە، لەوتارەکەیدا گوتویەتی "دەمویست لەخەبات بەردەوام بم و کۆڵ نەدەم بەلاّم بەرژەوەندیی بەرزی ولاّت گرنگتر بوو، بۆیە بڕیاری کارکەناریم دا".

٢-دەنگوباسی ئەمڕۆش وای رادەگەیەنێ کەدوژمن لەکۆڕەك‌و بێخاڵ‌و گۆڕەزو بەجادەی سرێشمە پەلاماری هێناوە. بەگوێرەی دەنگوباسی ئێزگەی ئێمە، دوژمن هیچ سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوەو زیانێکی زۆریشی پێ کەوتووە.

لەهەواڵی دووهەمدا ئێزگە گوتی: زیاتر لەسەد سەرباز تەرمی لەمەیدانی شەڕ بەجێ ماوە.

هەروەها لەبەرەی رۆژهەلاّت لەڕانیە، وا دیارە دوژمن گەیشتۆتە چیای کێوەڕەش. هەرچەند ئێزگە دەڵێ دوژمن شکاوە بەلاّم مومکینە دوژمن سەری کێوەڕەشی کۆنترۆڵ کردبێ. ئەگەر وابێ، دەشتی سەنگەسەرو

قەڵادزێ مەترسییان لەسەرە.

ئەگەر بێتو بەرگریی پێشمەرگە لەدەربەندی رانیە توندو بەقوەت بێت، دور نیە دوژمن لەدەشتی سەنگەسەرو قەڵادزێ سەرباز بە پەرەشوت دابەزێنێ بەڵام گومانم هەیە ئێستا دەربەندی رانیەی گرتبێ.

### ١٠ی ئابی ١٩٧٤

شەڕ لەوپەڕی توندیدا بەردەوامە لەنێوان هێزەکانی بەعسو پێشمەرگەدا لەهەردوو بەرەی باڵەكو رانیە. لەبەرەی باڵەك دوژمن دەیان هێرشی بەپیادەو بەپاڵپشتی تۆپو فڕۆکە کردۆتە سەر هێڵی بەرگریی پێشمەرگە لەدارەهیشکی کۆڕەك و گەلی بێخاڵ و گۆڕەز بەڵام لەهەموی شکاوەو پشتاوپشت گەڕاوەتەوە، دوای ئەوەی دەیان تەرمی لەمەیدانی شەڕ بەجێ هێشتووە، تەنانەت نەیتوانیوە پێنج سەد مەتریش بێتە پێش.

لەبەرەی رانیەش دوژمن هێرشی یەك لەدوای یەکی کردۆتە سەر بەتالیۆنی یەکی بێتواتە لەچیای کەپکی خانزادو دەیان لاشەی لەشەڕگەکە لێ بەجێ ماوەو، تائێستا نەیتوانیوە چیاکە بەتەواوی بگرێت.

هەروەها لەچیای کێوەڕەشیش دوژمن نەیتوانیوە داگیری بکات. ئەمشەو فڕۆکە دیاناو هاردیانو خەلانو مێرگەسۆری بۆردومان کردوە، هەروەها ناوچەی برادۆستیش.

### ١١ی ئابی ١٩٧٤

شەڕ لەهەردوو شەڕگەکە لەوپەڕی توندی دایەو دوژمن نەیتوانیوە هیچ بەدەست بێنێو زیانێکی زۆریشی بەر کەوتووە. شەڕ لەبەرەی باڵەك کەمترە بەڵام لەبەرەی خانزادو کێوەڕەش دوژمن هێرش لەدوای هێرش دەکاتو سەرناکەوێ.

ئەمڕۆ لەبەرەی بەتالیۆنی ٣-٤ی باڵەك ٩٣ تەرمی سەربازو جاش بەدەستی پێشمەرگە ژێر گڵ کراوە کەهی شەڕی رۆژانی ٨و ٩و ١٠ی

مانگەو دەیان لاشەی تریش لەم لاو لەو لا ماوە.

١٢ی ئابی ١٩٧٤

شەڕ لەبەرەی باڵەك كەمە بەڵام تۆپو فڕۆكە بەبێ وچان بۆمبارانی ناوچەكە دەكەن. بارودۆخی شاری ڕەواندز زۆر خراپە، ئەویش لەبەر تۆپو فڕۆكەو زۆری وێران بووە.

بەڵام لەبەرەی ڕانیەو بێتواتە شەڕ هەر وەك خۆیەتی، توندوتیژە. شەڕو كوشتار بۆ داگیركردنی كێوەڕەشو كەپكی خانزادە بەڵام دوژمن هێشتا ئامانجی بەتەواوی نەهێناوەتە دیو جێو زۆر زیانی بەر كەوتووە. هەڵبەت لەڕیزی پێشمەرگەش كوشتار زۆرە.

١٣ی ئابی ١٩٧٤

١-دوا دەنگوباس لەئێزگەی دەنگی كوردستان ئەمشەو وای ڕاگەیاند كە شەڕ لەبەرەی باڵەك كەمە، تەنها مەفرەزەكان لەكار دان، بەڵام تۆپو فڕۆكە بەردەوام بۆردومان دەكەن. لەبەرەی بێتواتەو كێوەڕەشیش شەڕ هەر وەك خۆی لەتوندی دایە.

بروسكەیەك بەناوی عەبدولوەهاب ئەتروشییەوە كەسەرپەرشتیی ئەو بەرەیە دەكات وای رادەگەیەنێ كەدوژمن لەماوەی ئەو چەند ڕۆژە زیاتر لە ٢٥٠ كوژراوو بریندای هەیە. هەروەها زیانی ماڵیشی زۆرە. بەڵام ناوبراو لەو بروسكەیەدا ئاشكرای كردووە كەزۆربەی چیای كێوەڕەش كەوتۆتە دەست دوژمنەوە، هەروەها دوژمن هەوڵ دەدا چیای ئاسۆس كەدەڕوانێتە سەر دەربەندی ڕانیە بگرێت بۆ ئەوەی لەدەربەند دەرباز بێت. كەپكی خانزادیش هێشتا نەگیراوە. بەڵام بەنەزەری من، دوژمن ئاسۆسی گرتووەو كێوەڕەشیش كەمی لەدەست ئێمە ماوە، كە كلكی خوارئاوایە نەك ئەو ناوچەیەی كەدەڕوانێتە سەر دەربەند.

لەو بڕوایەش دام كەمادام عەبدولوەهاب چۆتە ئەم بەرەیە، بێ شك

پێشمەرگە شکست دەهێنێ‌و ئەوێمان لەدەست دەچێ چونکە عەبدولوەهاب تەنها بەناوی خۆیەوە بروسکە دەنێرێ، پێشمەرگەو بەتالیۆن‌و لقەکانیش هیچ. ئەمەش لەڕوی مەعنەویاتەوە زۆر خراپە چونکە پێشمەرگە بەڕۆوە دەنازێ کەناوی بەڕەشیدی‌و غیرەتی بخوێندرێتەوە، نەك پێشمەرگە شەڕ بکات‌و خۆی بەکوشت بدا، کەچی یەکێکی تر بروسکە بکات. پەندێکی کوردی دەڵێ "کێلەشین خەڵك دەکوژێ، کەر گەوزین ناو لەخۆ هەڵ دەدا"

٢-گفتوگۆی تورکیاو یۆنان‌و ئینگلیز لەجنێڤ بەرەو شکست دەچێ‌و دوریش نیە هەڵبوەشێتەوە چونکە دوای چەندین هەفتە گفتوگۆ، تا ئێستا نەگەیشتونەتە ئەنجام، هەرچەند شەڕ لەدورگەکە وەستاوە و تەنها جاروبار تەقە هەیە.

تورکیا داوای حوکمی فیدراڵی بۆ دە هەزار تورکی قوبرسی دەکات کە لەگەڵ یۆنانییەکان لەسەر دورگەکە دەژین‌و داوای ئۆتۆنۆمییەکی فراوانیش دەکات. بەڵام یۆنان ئەمە رەت دەکاتەوەو دەیەوێ تەنها یەك حکومەت بۆ هەردولا هەبێت.

بەهەر حاڵ، دوێنێ تورکیا ئینزاری دا بەیۆنان کەئەگەر بێت‌و لەماوەی ٢٤ سەعات رای ئەو پەسند نەکات گفتوگۆ بەهەڵوەشاو حیساب دەکاو ئیلتیزام ناکات، ماوەی ئینزارەکە تا بەیانیی ١٤ی ئابە.

با بزانین چی روو دەدات، هەرچەند دڵنیاشم سەد لەسەد شەڕ دەست پێدەکاتەوە لەقوبرس. شایانی باسیشە کەهەزاران تانك‌و تۆپی یۆنانی هاتۆتە سەر سنوری نێوانیان‌و دەستیش بەلوغم چاندن کراوە. هەڵبەت سوپای تورکیاش هەر لەشەڕی یەکەمەوە لەئینزار دایە.

**١٤ی ئابی ١٩٧٤**

١-ئەمڕۆ سەعات ٥ی بەیانی، فڕۆکەی تورکیا پەلاماری یۆنانییە قوبرسییەکانی داو کەوتە بۆردومان کردنی ئێزگەکەیان. دوا بەدوای

ئەمەش دەیان تانك هێرشی کردە سەر سوپای یۆنانییە قوبرسییەکان کەئەفسەری یۆنانی سەرکردایەتییان دەکا.
شایانی باسە کە لەشەڕی پێشودا نزیکەی ٣٥٠٠ سەربازو ئەفسەری تورك لەلای یۆنانییەکان بەدیل گیرا بوون، کەچی نزیکەی ٤٠٠ یۆنانی دیلی تورکیا بوون.
تا دوای نیوەڕۆ شەڕ بەردەوام بووەو تانكو فڕۆکەش بەشدار بووە لەشەڕدا.
ئەمڕۆ سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ ئێزگەکان دەریانخست کەیۆنان لەپەیمانی ئەتڵەسی (ناتۆ) دەردەچێ چونکە بۆی دەرکەوتووە کەپەیمانەکە هیچی پێ ناکرێو نەیتوانیوە کێشەی قوبرس لەنێوان دوو دەوڵەتی ئەندام لەو پەیمانە چارەسەر بکات. شەڕ تا ئێوارە هەر بەردەوام بوو.
٢-ئەمڕۆ دوژمن لەبەیانییەوە لەدەریاچەی دوکان پەڕیوەتەوەو پەلامارێکی دڕندانەی چیای تاسۆسی داوە، هەرچەند هەواڵەکان ئیشارەت نادەن بەسەیتەرەی دوژمن بەسەر ئەو بەرەیەدا بەڵام دڵنیام دوژمن زاڵە. هەڵبەت ئەمەش زیانێکی عەسکەرییە چونکە دەربەندی رانیە دەکەوێتە دەست دوژمن.

### ١٥ی ئابی ١٩٧٤

هەر لەشەوەوە، دوای چەندین رۆژ لەهێمنی، شەڕ لەبەرەی باڵەك هەلگیرساو دوژمن جارێکی تر هێرشی هێنایەوە سەر بەرەی گۆڕەزو بەتالیۆنی عیززەت سلێمان بەگ کە بەتالیۆنی ٤ی باڵەکە. لام وایە ئەمجارە دوژمن هەندێ دەستکەوتی وەدەست هێناوە، بەزۆریش لەبەرەی گۆڕەز. دوژمن دەیەوێ رێگا بۆ تانك لەکۆڕەکەوە بۆ بێخاڵ بەبلدۆزەر دروست بکات.
شەڕ تا شەو هەر بەردەوام بوو، تەنانەت لەسەعات ٥ی ئەمشەویش شێلکەی تۆپ بەئاشکرا لەخەلانو دەوروپشتی دەبینرا. سەر لەئێوارەش

سێ فڕۆکە دوو جار هاتن و تا حاجی ئۆمەران چوون و هەزاران گوللەیان لەلایەن تۆپی دژە ئاسمانییەوە تێ گیرا بەڵام سودی نەبوو.

٣-لەقوبرس شەڕ بەردەوامەو ئەمڕۆ سوپای تورکیا بەندەری فماگوفتای باکوری ڕۆژئاوای دورگەکەی داگیر کردووە.

**١٦ی ئابی ١٩٧٤**

١-شەوی رابردوو پێشمەرگەکانی هێزەکانی خەباتو رزگاریو زمناکۆو دەشتی هەولێر هێرشێکی زۆر زۆر خوێناوییان کردە سەر سەربازگەی گۆڕەزو تا بەرەبەیانی ئەمڕۆ هێرشەکە بەردەوام بووە. بەرۆژیش دیسان پەلاماری تر کرا. ئەنجامی شەڕەکە کوژرانی ٢٥ سەربازو ئەفسەرێك بەڕوتبەی مولازم بوو، چەکەکانیان کەوتە دەست پێشمەرگە. لەم هێرشەی پێشمەرگەدا چەند ڕەبیەکی دەوروپشتی بارەگای فەوج گیرانو ئەوەی کەرزگاری بوو خۆی بەناو سەربازگەکەدا کردەوە.

هەرچەند بۆ پڕوپاگەندە وا بڵاو کرایەوە کەگۆڕەز گیراوە بەڵام لەڕاستیدا ئێزگەکەمان دانی بەوەدا نا کەتەنها چەند ڕەبیەیەك گیراوو بەس.

زیانی دوژمن ٢٥ کوژراو و یەك دیلو ژمارەیەکی زۆر زۆر بریندار، دەستکەوتیش ٢٥ کلاشنکۆف و ٣ گرینۆفو تۆپێکی ٢ گرێ و هەندی چەکی تر لەگەڵ ٢ جیهازی کۆل بوو.

زیانی پێشمەرگەش بەگوێرەی قسە نەك بەگوێرەی سەرچاوەی ڕەسمی (چونکە ئێزگە باسی زیان ناکات) نزیکەی ١٨ تا ٢٤ شەهیدە لەوانە یەك سەرلق کەتەرمەکەی خرایە ناو سندوقو ڕەوانەی شوێنی خۆی کرا، نازانم ناوی چیەو خەلکی کوێیە. ژمارەی برینداری پێشمەرگەش لەژماردن نایە. جەوهەری باس، ئێمە زیانمان لەدوژمن زۆرترە. دوا هەواڵی زیانەکان دەڵێ زیانی ئێمە زیاتر لە ٣٠ شەهیدە.

تێبینی: دوای پرسیار دەرکەوت سەرلقە شەهیدکراوەکەی ئەم شەڕە

گەنجی جوانو ئازاو مەرد هاوار نوری حەلاوە کەپێشمەرگەی هێزی زمناکۆیە. هەزاران سڵاوت لێ بێ پاڵەوانی شەهید. زۆر زۆر دۆست بوین. چەندین جار پێکەوە (لەپێشمەرگایەتی) شەڕمان کردوە.

٢-شەڕی قوبرس تا ئێوارە بەردەوام بوو. تورکیا فەرمانی نەتەوە یەکگرتووەکانی بەجێ هێنا، ئەویش دوای ئەوەی کەزەویی ئۆتۆنۆمیی تورکەکانی داگیر کردو لەسەعات حەوتی ئێوارە شەڕی راگرت.

حکومەتی یۆنان نەیتوانیوە بەسوپا تەدەخول بکا لەقوبرس چونکە سوپای یۆنان زۆر لاوازەو چەند ساڵێکیشە حوکمێکی نارەوا لەسەر کورسیی وڵاتەو بۆتە هۆی دواکەوتن. حکومەتی مەدەنیی تازەش نەیتوانیوە هیچ بکات. وەزیری دەرەوەی یۆنان ئەم بێهێزییەی ئاشکرا کردو دوێنێ گوتی: "ئێمە هیچ نیازمان نیە سوپا بۆ قوبرس بنێرینو تەداخول بەسوپا ناکەینو تەنها لەیەك بەرە دێینە مەیدان ئەویش بەرەی دیپلۆماسییە".

هەڵبەت لەمەوبەر وتبوم یۆنان لەڕوی سوپاییەوە لەپەیمانی ئەتلەنتیك کشاوەتەوە بەڵام لەڕوی سیاسییەوە هەر تێدایە.

٣-ئەمڕۆ بیرەوەریی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانە کە٢٨ ساڵ لەمەوبەر دامەزراوە. بەم بۆنەیەوە ئێزگەی دەنگی کوردستان سەعاتێك بەرنامەکەی پێش خستو لەسەعات ٧ لەجیاتی ٨ کرایەوەو تا ١٠ی شەو بەردەوام بوو. وتاری سەرۆك بارزانی بەبۆنەی دانانی ئەم حزبەوە خوێندرایەوە. چەند بروسکەیەکیش کەبۆ مەکتەبی سیاسیو بارزانی نێردرا بون، خوێندرانەوە.

منیش ئەمڕۆ نامەی پیرۆزبایم بۆ مەکتەبی سیاسیو بارزانی و بۆ برایان کاك ئیدریسو کاك مەسعود نارد. ئەمەش دەقی نامەیەکە:

الاخوان المحترمون

اعضاء المكتب السياسي واللجنة المركزية للحزب الديمقراطي الكردستاني

تحية صادقة من قلب شاب ينبض شغفا واشتياقا لخدمة الحزب والأخلاص له. كلي امل وثقة بنصر الحزب وثورتنا القومية المجيدة.

اسمحوا لي وانا المهمل والملقى خلف جدران النسيان واللاوجود ان اهنئكم وكل انسان مؤمن بالحزب. واهنيء قائد الحزب والثورة الاب الجليل بارزاني بمناسبة ذكرى طي ثمان وعشرين صفحة عظيمة بيضاء ناصعة مليئة بالمعجزات والمنجزات والاعمال الخارقة لحزبنا الديمقراطي الكردستاني منذ تأسيسه.

ان الحزب اليوم اذ يتوج بوضع التاج الثامن والعشرين من شرف قيادة شعبنا الكردي على رأسه وقيادة الجماهير خلال مختلف مراحل الحياة السياسية والعملية المشفوعة بالبطولات والتضحيات ويشهد على ذلك جداول الدماء الزكية التي سالت ولا تزال تسيل من الافواه المزدوجة لجروح الحزب والشعب ومن سواقي دموع جماهير هذا الحزب.

ان الواجب والشرف القومي يحتم على كل مخلص لشعبه ان يقف مكتوف اليدين اجلالا وتقديرا لعظمة هذا الحزب الصلد الذي ثبتت جدارته وقدرته في ترسيخ جذوره عميقا في تربة الجماهير وداس بقدمين ثابتتين راسختين اشلاء من استبقاه التاريخ في هاوية سفلى من حتمية فرز الحزب بعيدا عنه من لا يستوفي اللحاق بركبه، حتى اخذ هذا الحزب وعلى رأسه بطل اسطوري فذ ينحني له التاريخ تعظيما لقيادة ثورة شعبنا القومية من اول ايام ومراحل الدفاع الاستراتيجي والدفاع الذاتي عن البقاء، الى التوازن الاستراتيجي وقيادة الثورة التي يكن لها الحاضر والمستقبل التقدير والتبجيل ما تستحقها في حرب جبهوية وجها لوجه مع عدو اغراه ما في حوزته من توصلات العقل البشري في حقل التدمير والابادة والقتل.

حزب قائد لم يكتف ولم يرض بقيادة الثورة والجماهير والدفاع عن الصمود الجبهوي فقط بل تعدت قدرته القيادية للشعب الى الهجوم الاستراتيجي المعاكس والمضاد وعلى جبهة العدو المحتل طموحا منه وواجبا للوصول الى الاهداف القومية والوطنية في خط قصير موازي لخط العصر، عصر طوى ماضي الافكار والاوهام الضيقة والشوفينية الغريبة عن العقل البشري المتطور.

ان ما تمكن من فعله حزبنا خلال حياته السياسية والعملية اندحر في ذلك الميدان كثير من الاحزاب والتيارات السياسية التي ادعت عطف الجماهير الكردية لها فأخفقت وباذلال في جبهة الصمود والبطولة التي تشرف بالفوز بها حزب الثمان والعشرين ربيعا.

والعظيم في هذا الحزب انه تجاوز الحدود القومية وحمل على عاتقه مسؤولية تحقيق الديمقراطية والسعادة للشعب العراقي بأكمله وحمل على عاتقه قبر الانظمة الديكتاتورية واحدة اثر اخرى، وآخرها طغمة البعث الفاشية الحالية، لذا يواجه حزبنا اليوم كقائد لشعبنا الكردي حملة عسكرية فاشية لا مثيل لها في تاريخ ثورتنا، يهدف وراءها البعث ومرتزقته الحمر والسود ابادة شعب مسالم مضطهد.

ان الجيش والمرتزقة المقادون من قبل طغمة فاشية هم اداة القمع والابادة الرئيسية بيد البعث الفاشي ويتسم هذا الجيش والمرتزقة بأنه متعجرف وحشي غريب عن آمال الشعب وتطلعاته وعن الوطن ويتصرف بتخطيط من الخبراء الحمر وكأنه قوات احتلال حقيقية. وتخفي هذه الطغمة الفاشية حملتها الدموية وراء حجة "حماية النظام والمؤسسات الاشتراكية وتطبيق الحكم الذاتي" وتدفع بسخاء من مال الشعب للمرتزقة ثمن ارواحهم التي تبتاعه منهم وثمن الخدمات البعيدة عن الشرف التي تقدم لها. ومن خزينة الشعب ايضا تدفع لتجار الحرب والسلاح ثمن وسائل القتل والتدمير والابادة الجماعية.

والغريب عن المرتزقة سود الوجوه من الاكراد ان البعث الفاشي يخضع تطلعاتهم الى مصلحة ذاتية مادية وحياة خضوع بلا شرف، فتقبل القيام بدرر باعة الوطن وتنفذ اوامر البعث بحذافيرها ضد ابناء قومهم، ويؤدي اعدادهم المشوه لهذه الجرائم القومية بواسطة معتقدات واساطير كاذبة حول تطبيق الحكم الذاتي المزعوم الى ان يتقطر العرق خجلا من جبين الشرفاء في قبول تلك المهزلة.

لا نستغرب ما نراه اليوم من اعمال وحشية دموية من قبل سلطة عسكرية فاشية ذات تركيب اجتماعي غير متجانس وهزيل اقتضت مصالحهم الذاتية رغم الميول والاتجاهات المتباينة الى التكالب على ثورة حزبنا وشعبنا الديمقراطية المحتوى والعمل، ولهذا فالواجب الوطني والقومي يحتم على الحزب القائد الرد على وحدة قوى الشر والخيانة المؤقت بوحدة قوى الشعب والخير الابدية، والعمل على تحطيم مقاومة العدو والحاق الهزائم المنكرة بوحدات جيشه ومرتزقته وتعريضها للموت المحتم من قبل طلائع الحزب المسلحة وجيشه المعنوي البيشمركة العظيم، درع الحزب والشعب الواقي والمضمون لأن البعث الضيق في افقه الفكري لا يستيقظ من الخدر الايديولوجي الذي تورط فيه الا تحت تأثير الضربات العنيفة من قبل جيشنا الثوري وحزبنا بقيادة اب الشعب العظيم البارزاني.

فألف تحية وتقدير الى حزبنا الديمقراطي الكردستاني بمناسبة ذكراه الثامن والعشرين.

العمر المديد لقائد شعبنا، البارزاني.
المجد والخلود لشهداء حزبنا وشعبنا.
والنصر المبين لثورتنا.

المخلص لكم ابدا
جوهر محمد آغا ميركەسوري
خلان ١٦/٨/١٩٧٤

**١٨ی ئابی ١٩٧٤**

دوژمن هەر خەریکی جادەیە لەنێوان دارەقەسپ لەکۆڕەکەوە بەرەو بێخاڵ.
ئەمڕۆ ئێوارە دوژمن لەکۆڕەکەوە پەلاماری بەتالیۆنی ٣-٤ی دا بەڵام سەر نەکەوت و نزیکەی ١٠٠ سەرباز کوژراوو بریندارى هەبوو. بەدرێژایی شەو شەڕ هەر هەبوو.

لەبەرەی کاوەشەوە سوپای حکومەت گەیشتۆتە قەڵادزێ، کەپکی خانزادیشی گرتووە. لەهێزی بێتواتە و لەچیای ماکۆك شەڕە.

**١٩ی ئابی ١٩٧٤**

١-ئەمڕۆ لەبەرەبەیاندا تانکی دوژمن لەکۆڕەکەوە سەرەو خوار، بەو جادەیەی کە لەکاتی شەڕدا دروستی کردووە، چووەتە دارەقەسپ و لەوێشەوە بۆ کۆنە سەربازگەی ملتۆکەر لەسەر رەواندز. دەڵێن ١٧ تانك بەشداری ئەو هێرشە بون. بەم کارە دوژمن توانیویەتی خەرقی بەرەی بەتالیۆنی ٤ بکاتو گەیشتۆتە ملتۆکەر.

٢-لەقوبرس هەرچەند شەڕ وەستا بوو، بەڵام ئەمڕۆ دیسان تانکەکانی تورکیا بەرەو پایتەخت هەڵکشانو شەش کیلۆمەتر نزیك بونەتەوە. تورکیا

لەم جموجوڵەی ئێستایدا ٨٠٪ی ناوچەی بەپیتو بەرەکەتی قوبرسی خستۆتە ژێر دەست.

**٢٠ی ئابی ١٩٧٤**

شەڕ لەبەرەی ڕەواندز بەردەوامە. دوژمن توانیویەتی چەند تانکێك بپەڕێنێتەوەو لای دەشتەدیانو دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرتووە. بەگوێرەی دانپێدانانی ئێزگەکەمان، ئەو تانکانەی لەکۆرەکەوە دابەزیون بۆ ڕەواندز ژمارەیان پەنجا تانك بووە. ئێستا تانك لەمەفرەقی دیانا دایە، دەشڵێن سەرێکیان لەلای هاودیانە.

بەکورتی، بەرەی گۆڕەز کشاوەتەوە بۆ زۆزك، بەرەی بێخاڵو بەتالیۆنی ٣-٤ یش کەوتۆتە هەندرێنو دۆڵی ناکۆیان.

لەبەرەی قەڵادزێش شەڕ بەردەوامە، دوژمن هێرشی بردۆتە سەر دۆڵی شەهیدان. هەروەها لەکوێستانی زەنگلاّنیش شەڕە.

**٢١ی ئابی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ سەر لەئێوارە، دەمەو خۆرئاوابون، دەنگی فڕۆکە لەلای گەلاّڵەوە دەهات. لەگەڵ پێشمەرگە مستەفا حەمە رەسول وەستا بووین سەیری ئاسمانمان دەکرد، چاومان لێ بوو خاڵێکی بچوك لەئاسمان دیارە. وامانزانی فڕۆکەیە بەلاّم فڕۆکە نەبوو. زۆری نەبرد شتەکە نزم بۆوەو زانیم کاغەزێکە بەئاسمانەوە. زۆری نەبرد کەم کەم کاغەزەکە دابەزی و بەدووریی دە مەترێك لەئێمەوە کەوت. مستەفا گورج رایکردو هێنای. سەیرم کرد بەیاننامەی حکومەتە، ناوی شێخ عوسمانی شێخ ئەحمەد بارزانیی بەوێنەوە لەسەرە.

بەیاننامەکە بەزاری بادینی نوسرابوو. هەندێ پەلاماری جنێوی کردبووە سەر مەلا مستەفاو دکتۆر مەحمود عوسمان[1]و سامی [1]و حەبیب محەمەد

[1] دکتۆر مەحمود عوسمان لەساڵی ١٩٢٨ لەسلێمانی لەدایك بووە. دەرچووی کۆلیجی پزیشکی زانکۆی بەغدایە. ئەندامی حزبی شیوعیی عیراق بوو. پاش ئەوەی پەیوەندیی

کەریم و داوای لەخەڵك و میللەتی بارزان کردبوو چەك فڕێ بدەن و شەڕ نەکەن و بگەڕێنەوە ریزی حکومەتەوە.

کەمێکیش بە بەڤن و باڵای بەعس و ئەحمەد حەسەن بەکردا هەڵیدا بوو.

هەمان بەیاننامە بەزمانی عەرەبیش نوسرابوو. دانەیەك لەم بەیاننامەیە لەپشت ئاوایی کەوتبوو، هێنایانەوە.

## ٢٢ی ئابی ١٩٧٤

١-ئەمڕۆش وەکو دوێنێ حکومەت بەفڕۆکە بەیاننامەی فڕێدایە خوارەوە، ئەمجارە بەزمانی عەرەبی و زاری سۆرانی نوسرابوو، تیایدا هێرش کرابوە سەر شۆڕش و بارزانی و داوای لەخەڵك و پێشمەرگە دەکرد بگەڕێنەوە ژێر چنگی بەعس و شەڕی سوپا نەکەن. تێیدا هاتبوو لەچیاکانیش شوێنی تاخمەکەی بارزانییان داگیر کردووە و بەم زووانە لەناوی دەبەن و زۆر قسەی قۆڕ و پوچی تریش.

هەروەها لەسەر کاغەزەکە نوسرابوو ئەو ئاوارانەی لەچادر دان لەئێران، زۆر بەڕەزاڵەت دەژین و سوپاو ئەفسەرەکانی ئێران دەستدرێژیی شەرەفیان

---

بەشۆڕشەوە کرد، بووە پزیشکی تایبەتی مەلا مستەفا بارزانی و هەروەها راوێژکاری سیاسیشی بوو. لەکۆنگرەی شەشەمی پارتیدا لەساڵی ١٩٦٤دا بووە ئەندامی سەرکردایەتیی پارتی.

[1] سامی ناوی خوازراوی محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمانە و زۆر جار بەسامی عەبدولڕەحمان ناوی دێت. لەساڵی ١٩٣٢ لەشنگال لەدایك بووە. ئەندامی حزبی شیوعیی عیراق بوو. پاش کودەتای بەعسییەکان لەساڵی ١٩٦٣، پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردو دواتر بووە راوێژکاری مەلا مستەفا بارزانی. لەساڵی ١٩٦٦دا بوەتە ئەندامی سەرکردایەتیی پارتی. پاش بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، کرایە وەزیری کاروباری باکور لەحکومەتی عیراق. لەساڵی ١٩٧٦دا سەرکردایەتییەکی کاتیی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان پێك هێنا. لەساڵی ١٩٧٩دا لەکۆنگرەی نۆیەم لەپارتی دەرکرا. لەساڵی ١٩٨١دا پارتی دیموکراتی گەلی کوردستانی پێك هێنا. لەساڵی ٢٠٠٤دا لەتەقینەوەیەکی تیرۆریستیدا لەهەولێر گیانی لەدەستدا.

دەکەنە سەر. بۆ نمونە، ناوی کچێکی تێدا هاتووە کەگوایە ئەم کچە تەمەنی ١٥ ساڵەو ناوی مەنیجە خدرە، باوکی قوماش فرۆشە لەهەڵەبجە. بەیاننامەکە دەڵێ ئەفسەرە ئێرانییەکان دەستدرێژیی شەرەفو ناموسیان کردۆتە سەر ئەم کچە کوردە.

ئینجا بەیاننامەکە بۆ وروژاندنی رق و قین دەڵێ: کەسانی وەك شەکیب عەقراوی نایانەوێ ناموس و شەرەفی خێزانە کوردەکان بپارێزن چونکە (بەقسەی بەیاننامەکە) پارەیان لە شاهنشاو[1] سەنتۆ وەرگرتووە. بەیاننامەکە زۆر هێرشی تریش دەباتە سەر شۆڕش.

بەڵام ئەم جۆرە کاغەزە زەردو سەوزانە کار ناکەنە سەر بیروباوەڕی خەڵك چونکە هەموو گەلی کورد حوکمی بەعس دەزانن چۆنەو ئەم قسانە پارە ناکەن.

٢-شەڕ لەبەرەی سەنگەسەر بەردەوامە. دیسان دوژمن لەناوچەی زەنگوڵ هێرشی هێناوەتەوە. سەر نەکەوتووە. ئەگەر دوژمن لەو کوێستانە سەر کەوێ، ئەوا دەکەوێتە ناو دەشت و راستایی زارگەلی‌و لیوژەو هەڕەشە لەدیلمان و قەسرێ دەکات.

٣-ئەمڕۆ لەشەڕی ماکۆك رۆژنامەنوسێکی ئەمریکی کە لەشەڕگەکەدا دەگەڕاو وێنەی سینەمایی (ڤیدیۆیی) دەگرت، زۆر خراپ بەتۆپ بریندار بووەو گیانی لەمەترسیدایە.

ئەم رۆژنامەنوسە لەمانگی نیسانی رابردووش راپۆرتی نوسی‌و وێنەی تەلەفزیۆنیی لەبارەی شەڕی کوردستانەوە گرتو بردییەوە بۆ ئەمریکا. ئەمە جاری دووەمە کەهاتۆتەوەو ئەمجارە بریندار بووە. ناوی رۆژنامەنوسەکە پیتەر ستێرکنەو خەڵکی ویلایەتی نیووجێرسیی ئەمریکایە.

---

[1] شاهنشا واتە شای شاکان. یەکێ لەنازناوەکانی محەمەد رەزا شای ئێران بووە.

### ٢٣ی ئابی ١٩٧٤

ئەمڕۆ، سەر لەبەیانی، سەعات ٦,١٥، دوو فڕۆکەی مێگ هاتنە سەر ناوچەی بەرزیۆەو تۆپە فڕۆکەشکێنەکان بەرەنگاریان بونەوەو یەکێکیان پێکا کە لەنزیك پردی بەرسرین کەوتە خوارەوەو شوفێرەکەشی بەپەرەشوت خۆی هەڵدابوو بەڵام مەفرەزەیەك گرتی و ئێستا لەبەندیخانەی خەلان بەندە.

فڕۆکەوان مولازمی یەکەم سەفاء شەلال خەلکی بەغدایەو فڕۆکەکەی مێگ ١٩ بوو لەپۆلێ لەفڕۆکەخانەی موسل هەڵساوە. ناوبراو دانی بەوەدا ناوە کەپۆلەکە شەش فڕۆکە بووەو ئەوانی تر نەوێراون نزم ببنەوەو ئەو نزم بۆتەوەو پێنجەکەی تر پشتیوانی بون، یەکسەر بەرەو تۆپی زەوی- ئاسمان نزم بۆتەوە بەڵام بەر لەوەی تەقە بکا پێشمەرگە پێکاویەتی و نەیتوانیوە هیچ بکات و فڕۆکەکە کەوتۆتە خوار.

هەروەها گوتی دوێنێ چۆتە ناو ئاسمانی ئێرانو تا نزیك رەزائیە[1] رۆیشتووەو مەبەستی لێدانی بنکەی ئاسمانیو عەسکەریی ئێران بووە لەنزیك سنور.

### ٢٥ی ئابی ١٩٧٤

١-حکومەتی بەعس ئەمڕۆ بەیانی لێبوردنی گشتیی لەرادیۆ راگەیاند بۆ ماوەی ٢٠ رۆژ بۆ کورد. ئەم بەیاننامە بێهێزو لاوازانە نیشانەی هیچو پووچیی بەعسییەکانە.

٢-شەڕ لەبەرەی ماکۆكو زەنگلان بەردەوامە. هەروەها بەتۆپ لەسەرریازگەی ملتۆکەرو باپشتیانو رەواندزو گەلی عەلی بەگ دراوە. دوو لوغمیش لەژێر دوو تانك تەقیونەتەوەو لەدەشتەوە دیارە کەتێکی داون.

---

[1] رەزائیە واتە شاری ورمێ (ئورمیە) کە لەسەردەمی رەزا شادا ناوەکەی کرا بەرەزائیەو پاش روخانی رژێمی شا لەساڵی ١٩٧٩، ناوەکەی وەکو خۆی لێ کرایەوەو بۆوە بەورمێ.

**٢٦ی ئابی ١٩٧٤**

شەڕ لەبەرەی ماکۆك‌و کێوەڕەش بەردەوامە. دوژمن زیانی باشی پێ کەوتووە. بەڵام وا دیارە هێرشی دوژمن زۆر چڕوپڕە.

**٢٧ی ئابی ١٩٧٤**

بەردەوام بەتۆپ لەرەواندزو ملتۆکەرو گەلی عەلی بەگ دەدرێ. لام وایە سوپا خەریکی چاك کردنەوەی پردەکانی ناو گەلی عەلی بەگە، دانەیەکی تەواو کردووەو خەریکی دانەیەکی ترە.

**٢٨ی ئابی ١٩٧٤**

١-شەڕ لەدۆڵی شاورێ لەوپەڕی توندی دایەو دوژمن لەچیای ماکۆك دابەزیوە بەرەو بەرزایی کە گوڵان دەکەوێتە خوار کلکی چیای کاروخ بەلای گەرووی ئەستێرۆکان.

هێزێکی زۆری پێشمەرگە بەرامبەر دوژمن وەستاوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا دوژمن جارێك بەباشی دەمکوت نەکراوە. دور نیە زۆریی لەشکر برسێتی لەبەرە دروست بکات، (بۆیە) بەتێڕوانینی من شەڕ بەدروستی ناکرێت. هێرشی دژ (چەواشە) بۆ سەر دوژمن نیەو رووبەڕوونەوە تەنها لەدۆخی بەرگری دایە. پێویست بوو بیر لەهێرشی دژ بۆ شکاندنی دوژمن بکرێتەوە.

شایانی باسە دوژمن لەبەرەیەکی بەرین‌و فراوان هێرشی هێناوە، هەر لەدۆڵی شەهیدان‌و زەنگلان‌و سەرکەپکان‌و ماکۆکەوە تا رەواندزو کۆڕەك. دوژمن لەبەرەی سەرکەپکان لەچیای پشت دێرێ بەرەو کوێستانی زارگەلی سەر کەوتووەو تانکەکانیش لەپلنگان جێگیر کراون.

بەرەی رواندز هێمنە، سوپا خەریکی پرد چاك کردنەوەیە ئینجا هێرش دێنێ بۆ سە ناوچەی بالەك و مێرگەسور.

٢-ئەمشەو ئێزگەکەمان بەسەرهاتێکی زۆر مەردانەی خوێندەوە کە بەسەر هاوولاتییەکدا هاتبوو.

لەشاری سلێمانی دەزگای ئەمنو ئیستخبارات پیاوێکیان بەتۆمەتی پشتگیری کردنی شۆڕشی کورد گرت. دوای ئەوەی لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا دایانڕزاندو لەهۆش خۆی چوو، خستبویانە ناو ترومبێلێکی ئەمن. حەوت پیاوی ئەمنیشی لەگەڵدا بوو. لەڕێگا هۆشی هاتبوە بەرو هۆشیار ببۆوە، یەکسەر بیری لەو نارنجۆکە کردبۆوە کە لەژێر کەلوپەل لەخۆی بەستا بوو. نەیکردبوە نامەردی، ئازایانە نارنجۆکەکەی خستبووە ناو ئەمنەکانی ناو ترومبێلەکەو مەردانەش خۆی لەترومبێلەکە هەڵدا بووە خوارەوە. نارنجۆکەکە تەقییەوەو پێنج پیاوی ئەمنی کوشت و دوو کەسیشی بریندار کرد. کابرای کوردیش بەساغ و سەلامەتی خۆی گەیاندبووە قوەتی هەتاو کە سەر بەبارەگای لقی ٤ی پارتییە.

ئافەرین سەد ئافەرین رۆڵەی کوردی ئازا. دەك دەستتان ساغ بێ و نەرزێن.

**٣٠ی ئابی ١٩٧٤**

شەڕ لەبەرەی بەردانگەو گولاڵن بەردەوامە. ناوچەی رەواندز شەڕی لێ نیە بەلام شەڕە تۆپ هەیە. فرۆکە کەم هاتوچۆ دەکات.

**١ی ئەیلولی ١٩٧٤**

شەڕ لەزۆر شەرگە هەیە. دوژمن لەبەرەی قەلادزێ پەلاماری دۆڵی هەڵشۆی داوەو تا ئەو بن بنارە سەر کەوتووە. لەدۆڵی شەهیدانیش هاتۆتە پێش.

لەبەرەی دۆڵی سەرکەپکانیش تا حەدێك سەرکەوتووە بەلام بەزیانێکی زۆر زۆر هاتۆتە نزیك چیای زارگەلی. لەپشتی گولاتیش شەڕ توندە.

لەبەرەی رەواندز وەزع هێمنە، تەنها شەڕە تۆپ هەیە، بەڵام دوژمن رەبیەکی لەگۆڕەکەر لەهەندرێن دروست کردووەو شەڕێکی بچوکیش لەوێ کراوە.

ئەمڕۆ تابلۆی بووکابێری تەواو بوو. یەك ساڵی رەبەقە خەریکی ئەم تابلۆیەم.

**٢ی ئەیلولی ١٩٧٤**

دوژمن بەهێزێك و ٢٠ تانك بەرەو دێلزیان کە لەولای دیاناوەیە هێرشی بردووە. شەڕە تۆپیش توندە.

**٣ی ئەیلولی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ دایکی غاندی لەگەڵ باوکی، کوێخا کەریم، هاتنەوە. بەپیریان چوم و زوو غاندیم وەرگرت و ماچم کرد، یەکسەر دایە قاقای پێکەنین.

ماوەی ٢٧ رۆژە بەسەردان چونەتە ماڵی باوکی لەکرماشان. شوکر غاندی تەندروستیی باشە. کەمێك فەرقی کردووە. پای دەدا بەر خۆی و کەم کەمە دادەنیشت.

**٥ی ئەیلولی ١٩٧٤**

١-مام کوێخا کەریم گەڕایەوە.

٢-لەبەرەی بەردانگە شەڕ توندەو لەبەرەی شێخان دوژمن هێرشی هێناوە.

٣-ئێزگەی ئیسرائیل دەربارەی مەسەلەی کورد کە لەرۆژنامەی واشنتۆن ستار نیووزەوە وەری گرتووە، باسێکی باشی بلاو کردەوە.



تابلۆی بووکا بێری کە جەوهەر محەمەد ئاغای مێرگەسۆری لەساڵی ١٩٧٣ دەستی بە کارکردن تێیدا کردبوو و لە ئەیلولی ١٩٧٤ تەواوی کردووە. تابلۆکە دەسترەنگینیی جەوهەرو سەلیقە هونەرییەکەی دەردەخات.

٦ی ئەیلولی ١٩٧٤

١-ئەمڕۆ سەعات ٧,١٠ی بەیانی، فڕۆکەکانی بەرەی نیشتمانی[1] بەتوندی پەلاماریان هێنایە سەر ناوچەی باڵەك و مەرزی ئێران و نزیکەی ٤ هێرشی توندیان کردە سەر ناوچەکە. دووکەڵ لەسەر چیای کاروخ بەرز بۆتەوە. هەروەها لەلای گەلاڵەش فڕۆکەکان بۆمبایان فڕێدا بەڵام بێ زیان بوون، تەنها یەك دوو برینداری سووك هەبوو.

فڕۆکەکانی بەعس ئاوایـیەکی ئێرانیان لەنزیك خانە لەناوچەی کەونە لاجان وێران کرد. لەم ئاوایـیەدا ١٧ کەس کوژراون و ٣٠کەسیش بریندارن، زۆربەی خانووەکانیش وێران کراون.

بۆمبایەکیش لەگوندی وەرتێی بن کاروخ ١٧ کەسی کوشتووەو ٣٠ی بریندار کردووە.

تۆپێکی وێلـیش کەسوپای بەعس ئاراستەی کاروخی کردبوو، لەگوندی خانەقا یەك دوو کەسی کوشتووەو هەندێکیشی بریندار کردووە. شەڕیش لەبەرەی گوڵان و بەردانگە هەر هەیە.

لەبەرەی شێخان شەڕ زۆر توندەو هەموو چەکێك لەم شەڕە بەکار هاتووە. لەبەرەی زاخۆش دوژمن هێرشی کردۆتە سەر ناوچەی پێشمەرگە، نزیکەی دوو کیلۆمەتر لەزاخۆ بەولاوە بەرەنگاری یەکتری بوون. بەگوێرەی هەواڵەکانی ئێزگەی کوردستان دوژمن شکاوە.

٢-شەوی رابردوو سەعات ٧,٣٠ رادیۆی ئیسرائیل لەدەنگوباسەکەیدا باسی ئەو وتارەی کرد کە لەرۆژنامەی "واشنتۆن ستار نیووز"ی ئەمریکی بڵاوکراوەتەوە. رۆژنامەکە نوسیبوی: جەنگێکی ئاشکرانەکراو (رانەگەیەنراو) لەکوردستانی عیراق هەیە کە ٢,٥ ملیۆن کوردی

---

[1] مەبەست بەرەی نیشتمانیو نەتەوایەتیی پێشکەوتنخوازە لەنێوان حزبی بەعسو حزبی شیوعیی عیراق.

گرتۆتەوەو حزبی بەعسی دیکتاتۆر لەبەغدا کەیەکێتیی سۆڤیێت پشتگیریی دەکا، ئەم شەڕە زۆر دڕندانەیە دەکاتە سەر کوردەکان بەجۆرێك کەچارەکە ملیۆنێك کوردی ناچار کردووە پەنا ببنە بەر ئێران. رۆژنامەکە گوتویەتی لەبارێکی وادا لەسەر هەموو رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پێویستە بەچاوێکی مرۆڤانە سەیری کێشەی پەناهەندە (ئاوارە) کوردەکان بکەن. هەروەها گوتویەتی حکومەتی ئێران دوانزە پەناهەندگا (کامپی ئاوارە)ی بۆ دامەزراندنی پەناهەندە کوردەکان دروست کردووە بەڵام وا زستان لەدەرگا دەداو پێویستە بەپەلە کار بۆ فریاکەوتنی پەناهەندە کوردەکان لەژن و منداڵ و پیر بکرێت کەزستانی داهاتوو چاوەڕێیان دەکات.

۳-هەروەها رادیۆی ئەهوازیش ئاشکرای کرد کەنوێنەری ئێران لەنەتەوە یەکگرتووەکان فەرەیدون هووەیدا ئەنجومەنی ئاسایشی ئاگادار کردۆتەوە کە زیاتر لە ۷۲ هەزار پەناهەندەی کورد لەعیراق هەڵاتون و پەنایان بردۆتە بەر ئێران دوای وێران کردنی دێهاتەکانیانو گوتویەتی کۆمەڵەی شێرو خورشیدی ئێران باری ئەمانی هەڵگرتووەو دەوڵەتیش سەد ملیۆن دۆلاری بۆ هەمان مەبەست بەم کۆمەڵەیە داوە. هەروەها پێویستە یارمەتی بدرێن.

**۷ی ئەیلولی ۱۹۷٤**

دوای نیوەڕۆ کردییە بارانێکی زۆر توندو بەقوەت. ئاو بەخوڕ لەسەر زەوی دەڕۆیشت. شەڕیش لەبەرەکاندا بەردەوامە.

**۹ی ئەیلولی ۱۹۷٤**

ئەمڕۆ دوژمن بەدوو رەتڵی گەورە بەتانك و ناقیلە پەلاماری دوو بەرەی دا. رەتڵێکی بەرەو بادینانو گەروی ئۆمەراغا، هی دوهەمیش بەرەو کەورێن و جندیان.

دوژمن لەبەرەی یەکەم سەرکەوتنی وەدەست هێناو توانی زۆر شوێنی گەروی ئۆمەراغار گردە کەوە داگیر بکات بەلام لەبەرەی دوهەم پەرەو جندیان سەر نەکەوت. بەگوێرەی هەوالەکانی ئێزگەی کوردستان، دە تانك و تانکهەلگر بەئاگری تۆپەکانمان تێك شکێنراون و لەوێ دوژمن بەسەرشۆڕی گەڕاوەتەوە. بەلام لەڕاستیدا توانیویەتی ناوچەی کەورین داگیر بکات.

١٠ی ئەیلولی ١٩٧٤

١-ئەمڕۆ پێشمەرگە قارەمانەکان توانییان گەروی ئۆمەراغا لەدوژمن پاك بکەنەوەو زیانێکی زۆری لێ بدەن لەڕوی گیانیو مالییەوەو چەند چەکێکی سەنگینیش بگرن لەوانە دوو رەشاشی گرینۆف و دوو دەکتاریۆف و چەند کلاشنکۆفێكو ٩ ئێستر.

٢-لەبەرەی دۆلەڕەقەو دۆلی شاورێش شەڕ زۆر توندەو دوژمن هێرش لەدوای هێرش دەکات. ئەمشەو دوژمن بەچەکی سپیو نارنجۆك هێرشی کردۆتە سەر هێزەکانمان. هەرچەند زیانمان پێ گەییوە بەلام دوژمن شکاوەو بەسەرشۆڕی گەڕاوەتەوە. ئێمە ٥-٦ شەهیدو ١٠-١٢ بریندارمان هەیە.

١١ی ئەیلولی ١٩٧٤

ئەمڕۆ یادی ١٣ سالەی بەرپابونی شۆڕشەکەمانە. ئەم ١٣ سالە پڕن لەشکستو سەرکەوتنو هێمنیو شەڕ. بەلام سوپاس بۆ خوا ڕۆژ بەرۆژ شۆڕشەکەمان هەر لەپێشکەوتن دایە.

وا ئەمڕۆش گەلی کورد جارێکی تر یادی ئەم جەژنە دەکاتەوە، ئەویش لەژێر سێبەری فڕۆکەی باجەرو سۆخۆیو مێگ و ئەلیووشنو لەناو ئاگری بۆمباو گوللەتۆپدا بەلام گەلەکەمان سورە لەسەر پێشکەش کردنی قوربانیی زۆرتر لەپێناوی وەدی هێنانی مافە رەواکانیدا. تومێدەوارم جەژنی ئەیلولی داهاتوو لەژێر سایەی ئەمنو ئاسایشو لەژێر

ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینە یاد بکەینەوەو گەلەکەمان بەئاواتەکانی شاد بوو بێت.

دوژمن دیسان هێرشی بردۆتە سەر گەروی ئۆمەراغاو شەڕ زۆر توندە. لام وایە دیسان داگیری کردۆتەوە. لەبەری دۆڵەڕەقەش هەر شەڕە.

## ١٣و ١٤ ئەیلولی ١٩٧٤

شەوی ١٣/١٤ی ئەیلول لەنیوەشەودا دوژمن هێرشێکی کتوپڕی کردە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە لەگەروی ئۆمەراغا بەڵام سەر نەکەوت و شەڕەکە کەوتە کاری نارنجۆکی دەستی و دواتر دوژمن بەسەرشۆڕی گەڕایەوە. دوای سەعاتێکی تر سەرلەنوێ هێرشی تری کردەوەو دیسان سەر نەکەوت. بۆ جاری سێهەم هەمان شەو لەبەرەیەکی بەرین و فراوان، هەر لەروباری موسەکاوە تا پشتی گردوگۆ، لەزۆزك پەلاماری هێنا. دوژمن لەم هێرشەیدا توانی لەلوتکەی سەرەوە لەبەرەی مستەفا نێرەیی و هەندێ شوێنی تر پایەك بۆ خۆی بکاتەوەو لەزۆزکیش هەندێك سەر کەوت.

بەڵام کەڕۆژ بوەوە پێشمەرگە هێرشێکی پێچەوانەو دژی کردە سەر سەنگەرەکانی دوژمن. بۆیە دوژمن پشتی شکاو بەدرێژایی بەرەکەو بەڕاکردن دابەزی تا دەشت و زورگەکان. لەم شکانەدا دوژمن زۆر تەرمی لەمەیدانی شەڕ بەجێ هێشت و پێشمەرگە چەك و جبەخانەی باشی وەدەست هێناو دوژمنی سەرشکێن کرد.

شایانی باسە لەم هێرشەدا حەمید ئەفەندی دەورێکی سەرەکیی لەشکاندنی دوژمندا هەبوو.

## ١٤ی ئەیلولی ١٩٧٤

ئەمڕۆ ئێوارە دایکم و خێزانم و منداڵەکانی کاك فاخیرو منداڵەکانی کاك حەمیدو هەدیەو زۆزك و کاروخ بەکۆمەڵ بەسەردان هاتنە ماڵی ئێمە

لەخەلان. زۆر خۆشحاڵ بووم بەهاتنیان، بەتایبەتی هاتنی خێزانی کاك فاخیر چونکە زیاتر لەسێ ساڵە نەمدیوە.
سێ شەو لامان دەمێننەوە: جێگامان زۆر تەنگ بوو بەڵام لەحەساری شێخ ژوورێکی ترمان پەیدا کرد بۆ خەوتنیان.

**١٧ی ئەیلولی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ چووم بۆ ئازادی. ترومبێلێکم بۆ ناردنەوەی میوانەکان هێنا کەچوونە چۆمان. زۆری نەبرد هەمان ترومبێل گەڕایەوە. وامزانی دەبێ شتێکی لەبیر کرد بێ یان شتێکی نەبردبێ، کەچی بەپێچەوانەوە ساج و پرێمزی بۆ هێنابووین بۆ نان کردن. زۆر سوپاسم کرد.
ئارازی کوڕی کاك فاخیریش لام مابوەوە چونکە چەند رۆژێکە دەستی راستی کەمێك شکاوەو لەبەر ناڕەحەتی، دوو جاری تریش لەشوێنی خۆی ترازاوە. بۆیە لام مایەوە تا دەستی چاك دەبێتەوە.

**١٨ی ئەیلولی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ یەکەم رۆژی مانگی رەمەزانە. یاڕەبی خودایە بەباش بۆمان حیساب بکەیت و ئەم رۆژوو و نوێژەی ئێمە قبوڵ بکەیت. ئەگەر خودا قبولّی بکات، ئینشاڵلا بەڕۆژوو دەبم.

**٢١ی ئەیلولی ١٩٧٤**

دوژمن هێرشێکی تری بردۆتە سەر گەوری ئۆمەراغا بەڵام دوای زیانێکی گیانیی زۆر بەشکست خواردوویی گەڕاوەتەوە دواوە. ئەم هێرشەی لەسەعات ٨,٣٠ی شەو کردبوو.

**٢٢ی ئەیلولی ١٩٧٤** ١

ئەمڕۆش دوژمن دیسان سەعات ١٢ی شەو هێرشێکی تری کردە سەر هەمان بەرە. جارێکی تر بەشکست خواردوویی گەڕایەوە.

لەبەرەی رانیەش دوژمن هێرشی هێنابوو بەڵام سەر نەکەوت. مەبەستم لەبەرەی رانیە، بەردانگەو لای پڵنگانە.

**٢٦ی ئەیلولی ١٩٧٤**

دوژمن هێرشێکی بەرفراوانی کردۆتە سەر ناوچەی هێزی حەمرین (ناوچەی سورچییەکان) و هەندێ سەرکەوتنی وەدەست هێناوە. هێرشێکی دوژمنیش بۆ سەر چیای زۆزك لەرێگای سەرچاوەی دیاناوە شکاوە.

**٢٧ی ئەیلولی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ ١٠ی مانگی رەمەزانە. شەڕ لەبەرەی هێزی حەمرین بەتوندی بەردەوامە.

کاغەزێکی برایان هات، دڵخۆشی کردم، هەروەها نامەیەکی خەلیلیش هات کە بەپۆستە ناردبوی.

ئێوارەی ئەمڕۆ سەعات ٨ی شەو دوژمن هێرشێکی زۆر بەرین و فراوانی بەپشتیوانیی دەیان تانك و ناقیلە کردە سەر بەرەی گەروی ئۆمەراغاو زۆزك. شەڕێکی ١٣ سەعاتی بەرپا بوو. پێشمەرگە توانی هێرشەکە تێك بشکێنێ و زیانێکی زۆری لێ بدات.

بۆ ئیسناد، دوژمن ئیشغالی بەرەی کەورین و گوانای کردبوو. لەوێ ١-٢ تانك تێك شکێنران.

شەویش دوژمن هێرشی کردەوە سەر بەرەی گەروی ئۆمەراغاو شکستی هێنا.

**٢٨ی ئەیلولی ١٩٧٤**

١-ئەمشەویش سەعات ١١ دوژمن هێرشەکانی تازە کردەوە بۆ سەر هەمان بەرە. هەر لەنیوەڕۆوە تا سەعات ٦ی ئێوارە، فڕۆکە بەبێ وچان بەسەر ئاسمانی بەرەدا سوڕاوەتەوە. لەداوی سەعات ٦، تۆپ دەستی پێ کرد تا ١١ی شەو. ئینجا هێرشی پیادە دەستی پێ کرد بەڵام پێشمەرگە لوتی

دوژمنی شکاندووە. شەڕ تا سەعات ٨ی بەیانی دەوامی کردو بەشکستی دوژمن کۆتایی هات.

بەڵام بەداخەوە دوای شەڕو لەکاتی حەسانەوەدا فڕۆکە پەلامارێکی کتوپڕی کردە سەر شوێنی حەسانەوەی پێشمەرگەکانو ٤ پێشمەرگە شەهید کرانو ١٩ی تریش بریندار بون. سەرباری چەندین شەهیدو برینداری شەڕەکە. لەبریندارەکانی ئەو شەڕە، حەمید ئەفەندی کە سەرلقێکی کۆنو زیرەکە. برینەکانی جێگای مەترسین.

٢-لەبەرەی هێزی حەمرینیش دوژمن هێرشی هێناوە.

## ٣٠ی ئەیلولی ١٩٧٤

هێرشەکانی دوژمن بۆ سەر بەرەی زۆزکو گەروی ئۆمەراغا بەردەوامن بەڵام دوژمن نەیتوانیوە شوێنەکانی بگرێت.

## ٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

شەڕ لەبەرەی رەواندز بەردەوامە. دوژمن بەڕێگای سەروکانی (دیانا) توانیویەتی کلکی زۆزك بگرێتو چەند رەبایەکی لەوێ دروست کردووە. شەڕیش بەردەوامە.

## ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

دوژمن سەرکەوتنی زیاتری بەدەست هێناوە خەریکە بەرە بەرە هەڵدەکشێ.

## ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

دوژمن توانیویەتی بگاتە کۆنە رەبیەکانی خۆی کەپێش وتووێژی ١٩٧٠ لەسەر زۆزك دروستی کردبون.

## ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

دوژمن هەر هەوڵ دەدات بچێتە پێشتر. ئێستا پێشمەرگەی هێزی

زمناکۆو خەبات بەرگری لەزۆزکو گەروی نۆمەراغا دەکەن چونکە پێشمەرگەی هێزی باڵەك لەم بەرەیە ئیسپاتی فەشەل بونی کرد بەرامبەر بەدوژمنو لەو شەڕانەدا ژمارەیەکی بێ شوماری پێشمەرگە ئازاکانی ئەو دوو هێزە شەهید کراونو بریندار بوون. شایانی باسە کەشەرێکی خەیاڵیو لەئەقڵ بەدەر لەگەڵ ئاگرو ئاسنی دوژمن دەکەن.

**٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤**

١-ئەمڕۆ چوم بۆ ناوپردانو کەوەرتێ بۆ نەخۆشخانە. بەر لە ١٠-١٢ رۆژ دەستم لەدیوار داو لەشوێنی بەستنەوەی پەنجەی قچیلك بەشانەی دەست ئێسقانەکە درزی دابوو. من زۆر لەبەری ناڕەحەت بووم. مۆڵەتم وەرگرت کەبڕۆم ئەشیعە بگرم.

فازلی فەرماندەی پاسەوانەکانو پاسەوانێکم لەگەڵ خۆم برد. هەروەها غاندیو دایکێ غاندیشم لەگەڵ بون. چوین بەرەو چۆمان. لەدەربەند ویستمان لابدەین بۆ ماڵی عەلی سەلیم بەگ کەلاری کەئەویش زۆر دەمێکە لەو ناوە دەستبەسەرە. بەڵام شوێنی ماڵەکەمان نەدەزانی. ناچار لەچاپخانەی مستەفا سلێمانی دابەزینو پرسیارم کرد. لەوێ توشی ئیسماعیل رەشید بەگی دەلۆ بووم. یەکترمان ماچ کرد. هەرچەند ئەو کەمێك لەمن بەگلەیی بوو، ئەویش لەبەر هۆیەك کەپێویست بەنوسین ناکات.

لەوەش سەیرتر ئاوڕم دایەوە لای دەستە راست، بینیم قالە سور کەیەکێکە لەکاربەدەستانی بەمۆو سەر بەهێزی زمناکۆیە، دانیشتبوو و ریشێکی درێژی بەردابۆوە. لەگەڵ ئەویش یەکترمان ماچ کرد. ئەویش لایەنێکی ململانێیە لەهەمان کێشەی ئیسماعیل رەشید بەگی دەلۆ. بەکورتی، هەرسێکمان دژی یەکتری بوین بەڵام من لایەنی غالب (براوە)و ئەوان لایەنی مەغلوب (دۆڕاو) بون. چەند دەقیقەیەك پێکەوە دانیشتین. ئیسماعیل رەشید بەگی دەلۆ لەبەتالیۆنی ٦ی بەمۆ سەرلق بوو. ئەو بۆ

کاری تایبەت هاتبوو. بەڵام قالە سور خۆی‌و بەتالیۆنەکەی داوا کرا بون‌و هاتبون بۆ ئەم ناوچەیە بۆ پاڵپشتیی هێزی باڵەك. بەتالیۆنەکەی ئەو یەکێك لەو بەتالیۆنانەیە کە بەرگرییان لەزۆزك کردووە. شەوێك بوو بۆ پشوودان ئاڵوگۆڕ پێ کردن. هێزێکی تر چوو بووە شوێنی ئەو.

قالە سور کەمێك باسی شەڕی بۆ گێڕامەوەو گوتی دوژمن ئێستا لەکۆنە ڕەبیەکانی پێشوو دایە. هەروەها گوتی گومانم هەیە ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین گیرا بێت چونکە ئەو هێزەی ئێمەی ئاڵوگۆڕ کرد، فەرماندەی بەتالیۆنەکەی کەناوی مولازم محەمەدەو خەڵکی سلێمانییە، دەستبەجێ شەهید کرابوو، هەندێ پێشمەرگەش بریندا بون. بۆیە دور نیە دوژمن لوتکە بەرزەکەی سەر گوندی زێوەی گرتبێت. هەروەها دەربارەی چۆنیەتیی شەڕ گوتی: ئەو شەڕەی ئێستا دوژمن دەیکات، هیچ کات نەیکردووە. پیادە ڕۆڵی نیە بەڵکو ڕۆڵە هەرە سەرەکییەکە تۆپ و فڕۆکە دەیگێڕێ، ئینجا پیادە دێتە شوێنی چۆڵکراو.

هەروەها گوتی: دوژمن لەدەقیقەیەکدا دەیان بەڵکو سەدان گوللە تۆپ لەیەك شوێن دەدات‌و وا لەشوێنەکە دەکات کەدارو بەرد بهاڕێ‌و هیچ گیانلەبەرێك لەهیچ شوێنێك نەحەوێتەوە. بەجۆرە ئێمە ناچار دەبین هێڵی یەکەمی بەرگری چۆڵ بکەین‌و بکشێینەوە بۆ هێڵی دووەم. بەڵام پیادەی دوژمن نایەتە شوێنی ئێمە، بەڵکو دەستبەجێ هێڵی دووەمی بەرگریش وەك یەکەم دادەبێژێت‌و پێشمەرگە ناچار دەبێت بۆ هێڵی سێهەمی بەرگری بکشێتەوە. ئینجا پیادەی دوژمن دەجولێ‌و ڕەبیەی لێ دروست دەکات. بەجۆرە، لەئەنجامی شەڕکەری‌و عینادیی پێشمەرگە لەشەڕدا، زیانێکی گیانیی زۆرمان پێ دەکەوێت. هەرچەند زیانی دوژمن لەگەڵ زیانی ئێمە بەراورد ناکرێ بەڵام دوژمن گوێی لەکوژرانی سەربازو ئەفسەر نیە، تەنانەت بەلایەوە ئاساییە بۆ گرتنی هەر شوێنێك سەدان سەربازو ئەفسەر بەکوشت بدات.

٢-كە لەلای قالە سورو ئیسماعیل هەلسّاین، چوین بۆ مالّی عەلی سەلیم بەگ کە لەسەرەوەی هەموو مالّەکانی دەربەندە لەڕوی نزارەوە. من عەلی بەگم نەدی بوو بەلاّم ناوبانگیم بیستبوو. بەپرسیار مالّەکەمان دۆزییەوە. کەنزیك بوینەوە، دیم لەبەر دەرگای مالّ عەلی بەگ لەگەلّ سێ پێشمەرگە لەسەر کورسی دانیشتووە، لەدورەوە بەپێکەنینەوە گوتم: ئایا میوان رادەگری؟

هەلسّایە سەر پێ و بەپیرمەوە هات. تەوقەیەکی گەرمان کردو خۆم پێ ناساند، زۆر خۆشحالّ بوو. جارێکی تر دەستی گوشیمەوە.

چوینە ژورەوە، دانیشتین. خانووەکە بچوك بوو، شۆڕش بۆی دروست کردبوو، دوو ژور لەناو دالاّنێك بوو. ئێمە لەژورێك دانیشتن. دیار بوو ژورەکەی تر هی مالّەوە بوو چونکە خێزانەکەی بەڕووخۆشییەوە بەپیر دایکی غاندییەوە چوو، غاندیی لەدەست سەندو بەخێرهاتنی ئێمەی کرد. ژنێکی روخۆش‌و مەرد بوو.

عەلی سەلیم بەگ پیاوێکی کورتە بالاّی گەنم رەنگی مەیلەو سوری خڕوپڕو روخۆش‌و مەردانە دیار بوو. تەمەنی دەوری ٤٥ سالّ دەبێ. شەدەیەکی لەسەر بوو. بەگوێرەی روخسار، زۆر پیاوانەو ئاقلّ‌و سادەو سەخی رەوشت‌و قسەخۆش دەردەکەوت.

جگە لەو سێ پێشمەرگەیەی لای دانیشتبوون، وا دیار بوو میوانی تریش خەریك بوو بێن. لەدیوی مالّەوە قرچەی رۆن‌و بۆنی شفتە دەهات. زۆری نەبرد ئیسماعیل رەشید بەگیش هاتەوە ئەوێ. هەلّبەت دەیزانی ئێمە لەوێین.

ئێمە زۆر نەماینەوە چونکە دەبوایە بەر لەسەعات ١٢ بگەمە نەخۆشخانە، بۆیە داوای لێبوردنم کردو داوای ئیجازەم کرد. بەهەر حالّ، زۆر ئیلحاحی کرد بەلاّم نەمتوانی بمێنمەوە. تەنها بەلّێنی ئەوەی لێ وەرگرتم کەدوای جەژن سەردانێکی تری بکەم. ئەو کاتە ٢٠ی رەمەزان بوو،

منیش بەرۆژوو بوم.

لەچۆمان منداڵەکانم دابەزاندو خۆم لەگەڵ فازل چوین بۆ کەوەرتێ. پاشان بۆ ئەشیعە هاتمەوە بۆ ناپردان. ئینجا گەڕامەوە کەوەرتێ بۆ لای دکتۆرەکان. لەوێ لیژنەی پزیشکی داوای کرد سەعات ٤,٣٠ی ئێوارە بچمەوە لایان چونکە لەئەشیعەکە دەرکەوتبوو کەئێسقانەکە تۆزێك شکاوە.

بەهەمان ترۆمبێل کەشۆفێرەکەی ناوی جەبار بوو گەڕاینەوە بۆ چۆمان و چومە ماڵەوە. مەبەستم خانووەکانی خۆمانە کەنزیکەی سێ ساڵ زیاترە ئەو خانووانەم نەدیوە، واتە ماڵەکانی باوکم و کاك فاخیرو حەمیدو ماڵێکی خۆیشم. تا ئێوارە لەوێ ماینەوە. شۆفێرەکە کەکوڕێکی مەرد بوو، ترۆمبێلەکەی بۆ بەجێ هێشتم و خۆی گەڕایەوە بۆ دەربەند.

لەمەوعیدی دیاریکراودا چومەوە بۆ کەوەرتێ بۆ لای دکتۆری جەڕاح کەناوی دکتۆر جەمالە. لەدوای لێ وردبونەوە، بڕیاریدا کەپێویست بە بەستن و گەچ کردن ناکاو تەنها گوتی لەئاییندەدا گرێی ئەو پەنجەیە لەپەنجەکانی تر نزمتر دەبێت و تەنها بەحەرەکە پێ کردنی چاك دەبێتەوە. لەچۆمان بەربانگم شکاندو لەسەعات ٧,١٥ گەڕاینەوە بۆ خەلان.

**٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤**

ئەمڕۆ لەئێزگەی دەنگی کوردستان بەرەسمی دان بەوەدا نرا کەدوژمن هەندێ شوێنی لەچیای زۆزك گرتووە، ئەویش لەبەر ئەوەی حکومەت لەرادیۆی بەغدا رایگەیاندبوو کەچیای زۆزکی بەتەواوەتی گرتووەو گوتبوی چۆمان و گەلاڵە لەژێر رەحمەتی تۆپەکانیان دان.

شەوی رابردوو ئێزگەی لەندەن هەمان قسەی بڵاوکردەوە، بۆیە دوای چەند رۆژێك بێدەنگی، ئێزگەی ئێمەش دانی پێدا نا. بەڵام حکومەتی بەعس تا ئێستا نکوڵیی لەوە دەکرد کە لەکوردستان شەڕ هەیە، کەچی

خۆی بەدرۆ خستەوەو ئەو هەواڵەی لەرادیۆ بلاوکردەوە.

شەڕ لەزۆزك بەردەوامەو تا دوێنێ گەروی ئۆمەراغا نەگیرابوو.

## ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

ئەمڕۆ کەپێنج شەممەیە لەخەلان کردمان بەجەژن. بەغداش ئەمڕۆی کردۆتە جەژن. ئێرانیش کوردیەتی بەجەژن بەڵام شۆڕش بڕیاری داوە سبەی، رۆژی هەینی، ببێتە جەژن.

ئەمڕۆ کەیەکەم رۆژی جەژنی رەمەزانە فڕۆکە زۆر بەسەختی بۆردومانی ناوچەی باڵەکی کرد.

ئەمڕۆ برادەرێکی مێرگەسۆری هاتە لامان، زۆر بەدیتنی دڵخۆش بوم. دەربارەی وەزعی ناوچەی مێرگەسۆر پرسیارم لێ کرد، گوتی: وەزع لەوێ هێمنەو مەترسیی شەڕ نەماوە چونکە (شێخ) محەمەد خالید بەدزییەوە وتووێژی لەگەڵ حکومەت هەیەو قاسدی عوسمانی برای و هی حکومەت بە بەردەوامی دێنە لای. بەگوێرەی زانیاریی تر، لەشکری ئەو لەگەڵ لەشکری حکومەت بەرامبەر یەکترین و لەگەڵ یەك پێدەکەنن.

هەروەها گوتی: دور نیە دوای جەژن بەئاشکرا پەیوەندی لەگەڵ حکومەت دابمەزرێنێ و رێگای مێرگەسۆر- گەلی عەلی بەگ بەرەو هەولێر بکرێتەوە. هەموو خەڵك هەستی کردووە شتێك لەنێوان (شێخ) محەمەد خالیدو حکومەت هەیە. بەڵام ئێمە نازانین داخۆ ئەم هەڵوێستەی (شێخ) محەمەد خالید بەرەزامەندیی ئەم لایە[1] یان سەربەخۆیە چونکە قسەیەکیش هەیە کەگوایە جەنابی بارزانی ئینزاری (شێخ) محەمەد خالیدی کردووە کەشەڕ بکات یان بگاتەوە بەعوسمانی برای.

---

[1] مەبەستی ئەوەیە کەئایا هەڵوێستەکەی شێخ محەمەد خالید بەئاگاداریو رەزامەندیی مەلا مستەفا بارزانییە یان شێخ محەمەد خالید لەخۆیەوەو بەبێ ئاگاداریی مەلا مستەفا پەیوەندیی لەگەڵ حکومەتی بەعسدا دروست کردووە.

### ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤

ئەمڕۆ منو دایکی غاندیو دوو پاسەوان چوین بۆ دەربەند بۆ ماڵی عەلی سەلیم بەگ کەلاری. گیسکێکی بۆ سەر بڕین. نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. مرۆڤێکی زۆر باشو خۆشو ئاقڵە. ئەویش لەدەربەند دەستبەسەرە. پاشان چوین بۆ چۆمان.

ئەمشەو زانیمان گەروی ئۆمەراغا کەوتۆتە دەست دوژمنو زۆزکیش بەتەواوی لەژێر دەستی سوپا دایە. پێشمەرگە بۆ سەری بەردی کشاوەتەوەو بنکەکانی بردۆتە گوندە دورەکانی وەك گەزنەو ئەولاتر.

دوژمن زنجیرەی سەرتیزی بەدەستەوەیە. سەرتیز دەکەوێتە نێوان زۆزكو گەروەبێش لەباکوری گوندی سیتکان. دوژمن لەو گوندە سەربازگەی کردۆتەوە. ئێستا دوژمن بەچەکی ئۆتۆماتیك هەڕەشە لەجادەی سەری حەسەن بەگ دەکات.

وەزع ترسناکە چونکە ئەگەر خوانەخواستە ئەم ڕێگایە بەتەواوی گیرا، ناوچەی بادینان یان دەبێ بەناوچەیەکی موالی [1] یان لەبرسان دەمرێ. کەسیش لەو ناوچەیە هی ئەوە نیە کە لەبرسان خۆی بکوژێ. هەروەها زانیومە شەوی ٢٤/٢٥ی ئەم مانگە مولازم عومەر بێداوی شەهید بووە.

---

[1] ناوچەی موالی لەفەرهەنگی زاراوەکانی حزبی بەعس بەو ناوچەیە دەگوترێ کەدژی بەعس نیەو لەژێر دەسەلاتی حکومەت دایە.



فاخر محەمەد ئاغا مێرگەسۆری پێشمەرگەی رۆژە سەختەکان و
پاڵەوانی شەڕی هەندرێن لە ساڵی ١٩٦٥

# بەشی سێیەم

## ٤ی ئازاری ١٩٧٥

ئەمڕۆ بڕیار وایە کۆنگرەی سەرۆکانی لوتکەی وڵاتە بەرهەم هێنەرەکانی نەوت لەجەزائیر ببەسترێ بۆ باس کردنی مەسەلەی نەوتو نرخیو وڵاتە کڕیارەکانو زۆر شتی تر کە بەم باسەوە بەستراون.

بەڵام ئەوەی بەنیسبەت ئێمە گرنگو پێویست بەنوسینە، ئەوەیە کە لەم کۆنگرەیە شای ئێرانو سەددام حسێن بەشداری دەکەنو زۆر هەوڵ دراوەو دەدرێ کەئەم دوو کەسە بگەنە یەكو ناکۆکییەکانی نێوان عیراقو ئێران لا ببەن. هەواری بوومەدیەن سەرۆکی جەزائیر بڕیاری داوە ناوبژیوانی بکاتو یەکێك لەو خاڵانەی باس دەکرێت کێشەی کوردو کەنداوو شەتولعەرەبە.

ئێران دەربارەی دەسەڵاتداریی خۆی لەکەنداوو شەتولعەرەب تەنها عیراق بەکۆسپ دەزانێ. هەروەها شاهنشا ئاگاداری هەڵوێستی حکومەتە لەعیراق کە تا چ ئەندازەیەك حەز دەکات شۆڕشی کورد لەناو بەرێتو دەشزانێ عیراق ئامادەیە دەستبەرداری زۆر خاڵی ناکۆك ببێت بەمەرجێك ئێران پشت بکاتە شۆڕشی کورد. بۆیە هەردولا ئامادەن پێك بێنو لەو پێکهاتنەدا حەتمەن ئێران دەیباتەوە.

بەڵێ، دوێنێ شاهنشا گەیشتە فردرگای جەزائیرو بومدیەن بەگەرمی پیشوازیی لێ کردو بۆ حەسانەوە لەبەشی تایبەتی شوێنی حەسانەوە دانیشتن چونکە بڕیار بوو دوای چەند دەقیقەیەکی تر فڕۆکەی سەددام حسێن دابەزێ. زۆری نەبرد سەددام لەفڕۆکە هاتە خوارو سەرۆکی جەزائیر

پێشوازیی لێ کردو یەکسەر بردییە ئەو شوێنەی شای ئێرانی لێ دانیشتبوو. لەوێ بەیەکتری ئاشنای کردن‌و هەردولا خۆش بەختییان بەم بۆنەیەوە بۆ یەکتری دەربڕی.

لەژێر کڵاوی هەر یەکێکیان سەدان دینامیێتی تۆقێنەرو تێکدەر هەیە دژی مافی گەلی کوردی بێ پشت‌و پەنا.

• من وەك هەر کوردێکی دڵسۆز بەنیگەرانییەوە چاودێریی ئەم وەزعە دەکەم‌و شەوو رۆژ گوێ لەرادیۆ دەگرم.

٥ی ئازاری ١٩٧٥

کۆنگرەکە بەردەوامەو سەددام‌و شاهنشا نێوانیان خۆشەو سەردانی یەکتر دەکەن.

٦ی ئازاری ١٩٧٥

ئەمڕۆ راگەیەنرا کەسەددام حسێن‌و شای ئێران توانیویانە بگەنە رێککەوتننامەیەك کەهیچ ناکۆکییەکی لەنێوان هەردوو وڵات نەهێشتۆتەوەو هەردوو سەرکردە لەو رێککەوتنە مورتاحن‌و بەنیازێکی پاکەوە گەیشتونەتە ئەنجام.

دەك ماڵت وێران بێت سیاسەت، بۆ کەس موڵك نیت. دوو گورگ بۆ خواردنی مەڕێکی بێدەسەڵات گەیشتنە یەك. هەروەها بڵاوکراوەتەوە کەشاهنشا داوای ئەحمەد حەسەن بەکری بۆ سەردانی عیراق قبوڵ کردووە، هەروەها سەددامیش دەچێتە تاران‌و بۆ کۆتایی هێنان بەوردەکارییەکان لە ١٥ی ئازار هەردوو وەزیری دەرەوەی عیراق‌و ئێران بەئامادەبونی وەزیری دەرەوەی جەزائیر لەتاران کۆ دەبنەوەو ئەگەر هەر کۆسپێك لەگفتوگۆدا هاتە سەر رێگایان یەکسەر پەیوەندی بەهەواری بومەدیەنەوە دەکەن.

بەم هەنگاوەش ئەو تۆزە تروسکاییەی هەمانبوو کەکۆسپ بکەوێتە سەر رێگایان ئەویش کوژایەوە.

یەکسەر کاریگەریی ڕێککەوتننامەکە لەسەر ئێمە دەرکەوت. شەوی پێنج شەممە لەسەر هەینی، هێزەکانی ئێران لەکامپەکانی قەسرو ماکۆس‌و ناوچەی دیلمان‌و سماقولّی‌و شێرکاوەو ئاشی خدر ئاغاو گەروەبێش‌و چۆمان‌و حاجی ئۆمەران کەنزیکەی یەك تیپ دەبن بەچەند بەتەریەی تۆپ‌و دژە ئاسمانی‌و چەندین موشەکی هۆك‌و چەکی تر، دەستیان بەکشانەوە کردو بەبێ وچان هیچ سەربازێکیان لەناوچەکانی شۆڕش نەهێشتەوە. هەمان شەویش سوپای عیراق پەلاماری بەرەکانی پێشمەرگەی داو هێرشێکی فراوانی کردە سەر زۆربەی بەرەکان‌و توانی بگاتە گەروبێش کە لەمەوبەر نەگەیشتبوییّ. هەروەها زۆرکی بەتەواوی گرت‌و لەهێلّی جادەی بەرزێوەش هێرشی هێناو تا هەوارە کۆن هات.

٧ی ئازاری ١٩٧٥

- ئەمڕۆ لەئێزگەکان خالّەکانی ڕێککەوتننامەی ئێران‌و عیراق باس کران‌و دەرکەوت سەددام حسێن زۆر زۆر سەری بۆ شا دانەواندووە بەئومێدی ئەوەی ڕێگاو کۆمەك لەشۆڕشی کورد ببڕدرێت.

١-ناوەڕاستی شەتولعەرەب ببێتە هێلّی سنور، لەکاتێکدا جاران عیراق باجی ترانزێتی لەپاپۆڕەکانی ئێران دەستاندو دەبوایە کەشتییەکان ئالآی عیراق بەرز بکەنەوە تا ڕەت دەبن، بەلآم ئێستا کەشتییەکانی ئێران بەئاوی خۆیاندا ڕەت دەبن.

٢-بەنیسبەت کەنداو، عیراق وازی لەداخوازییەکانی سەبارەت بەسێ دورگەکەی تونبی گەورە تونبی بچوك‌و ئەبو موسا[1] هێناوە کەئێران لەساڵی ١٩٧١ داگیری کردون‌و هیچ کۆسپێك ناخرێتە سەر ڕێگای

[1] تونبی گەورەو تونبی بچوك‌و ئەبو موسا سێ دورگەن لەکەنداوی فارس. شوێنەکەیان زۆر ستراتیجییە. تا ساڵی ١٩٧١ لەژێر دەسەلآتی بەریتانیادا بوون. بەلآم پاش ئەوەی بەریتانیا چۆلّی کردن. ڕژێمی شا دەستی بەسەردا گرتن.

هاتوچۆی کەشتیی ئێران‌و لەمەودوا دەبێ پاپۆڕی عیراق‌و عەرەب لەژێر لوتی سوپای ئێران ڕەت بن. ئەم دەستهەڵگرتنەی عیراق بۆ ئێران داننانە بەوەی کەئێران مافی هەیە سوپا بۆ عومان بنێرێت بۆ لەناوبردنی شۆڕشی عەرەبە چەپڕەوەکانی زەفار[1].

٣-سنور دادەخرێت‌و ڕێگا نادرێت هاوولاتییانی هەردولا ئەمبەرو ئەوبەر بکەن‌و هەردولا هەوڵ دەدەن هێمنیی سنور بپارێزن‌و دەست لەکاروباری ناوخۆی یەکتر وەر نەدەن.

ئەمەیە ئامانجی سەددام حسێن‌و هەموو هەوڵی بۆ ئەوە بوو تاکو سنور دابخرێت‌و کورد بێ پشت‌و پەنا بێت.

هەڵبەت ئەم کارە تەئسیری کردۆتە سەر نەفسیەت‌و مەعنەویاتی خەڵک‌و جۆرە ترسێکی شاراوەی بلاوکردۆتەوە. خەڵک کەوتۆتە خۆ-و کاربەدەستەکانی شۆڕش دەستیان بەئاودیوکردنی ماڵ‌و منداڵ‌و کەرەستەی بەنرخیان بۆ ئێران کردووە. بۆیە میللەتیش زۆرتر هەستی بەمەترسی کردووە.

هەروەها جەنابی بارزانیش ناڕەحەتە لەرێککەوتنەکە، بۆیە زوو خۆی گەیاندە تاران بۆ ئەوەی ئێران هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەشۆڕش ڕون بکاتەوە[2].

---

[1] زەفار هەرێمێکە لەعومان، لەبەری ڕۆژهەڵاتدا هاوسنورە لەگەڵ یەمەن‌و لەباکوردا لەگەڵ سعودیەو لەباشوردا دەڕوانێتە سەر دەریای عەرەب. لەنیوەی یەکەمی حەفتاکاندا زەفار بزوتنەوەیەکی چەپی شۆڕشگێڕی تێدا پەیدا ببوو کەدژی ڕژێمی سوڵتان قابووس خەباتی دەکرد. شای ئێران بۆ پشتگیری کردنی ڕژێمەکەی سوڵتان قابوس هێزی بۆ عومان نارد بۆ شەڕکردن لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان.

[2] لەڕاستیدا لەکاتی واژۆکردنی ڕێککەوتنامەی جەزایردا، مەلا مستەفا بارزانی بۆ چارەسەر لەتاران بوو، دکتۆر مەحمود عوسمانیشی لەگەڵدا بوو. بۆیە لەوێ مایەوە تا شا گەڕایەوەو هەوڵی بینینی دا.

**٨ی ئازاری ١٩٧٥**

ترسێکی زۆر لەناو خەڵك بڵاو بۆتەوەو دەستیان کردووە بەناردنی خاوخێزانیان بۆ ئێران. پاشەڕۆژێکی تاریك سەبارەت بەچارەنوسی شۆڕش دێتە بەرچاو.

بەکورتی، جەوێکی تەمومژاوی بڵاوبۆتەوە، تەنانەت کاربەدەستانیشمان ناتوانن رای یەکلاکەرەوە بدەن.

**٩ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەمڕۆ حکومەتی بەعس بەیاننامەی لێبوردنی گشتیی راگەیاندو تێیدا باسی کردبوو لێبوردن هەموو عەسکەری‌و مەدەنی لەسەر هەموو بابەت‌و سەرپێچییەك دەگرێتەوە. بەڵام بەیاننامەکە زۆر توندوتیژ بوو و سەرەتاکەی بەجۆرە بوو: لەبەر ئەوەی دەستەی خۆفرۆش‌و یاخی لەدوا هەناسە دایەو لەچیاکان گیری خواردووە، وامان بەباش زانی کە رێگا بەهەموو عەسکەری‌و مەدەنی بدەین واز لەو دەستەیە بێنن‌و خۆیان بگەیەننە نزیکترین دەزگای عەسکەری‌و پۆلیس‌و مەدەنی‌و دەست بکەنەوە بەکاروبار بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵات.

بەیاننامەکە تا ١ی نیسانی ١٩٧٥ کاریگەرەو بەس. بەکورتی، بۆنی کوشتن‌و برین‌و بارودی لێ دەهات.

لام وایە زۆر کەس بۆ ناو حکومەت دەگەڕێتەوە چونکە مەعنەویات زۆر لاواز بووە.

پێویستە بڵێم لەم رۆژانەدا فرۆکە دەورێکی گەورە لەتێکدانی وەزعی خەڵك دەگێڕێ‌و خەڵك بەم سەرمایە بەڕۆژ دەچێتە دەرەوەو تا شەو دادێ ئینجا دەگەڕێتەوە ماڵ، بەفریش لەسەر زەوییە.

**١١ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەمڕۆ بیرەوەریی یەکساڵە بەسەر تێکچونی ڕێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٧٠دا تێدەپەڕێ. لەو ڕۆژەدا حکومەت بەبۆنەی ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمییە ناتەواوەکەیەوە ئاهەنگی گێڕاو دەستی کردەوە بەهێرش کردنە سەر شۆڕش، وا ئەمڕۆش داوا لەخەڵك دەکات بگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

کوردە زۆڵەکانیش دریغی لەتێکدانی ریزی شۆڕش‌و کورد ناکەن‌و هەر لەوێنەی کەو بانگی براکانیان دەکەن تاکو بچنەوە بن لولەو ڕەحمەتی تفەنگی ڕاوچی.

دەك ماڵت وێران بێ، بەختی کورد. تا کەی هەر دوژمنی خۆت دەبیت‌و تا کەی حەز لەخزمەتی بێگانە دەکەیت. دە با ڕوتان ڕەش بێت کوردە بێ خێرو بێ شەرەفەکان کەواز ناهێنن لەلستنەوەی پێڵاوو سفرەی دوژمن.

ئەمڕۆش فڕۆکەی باجەرو سۆخۆی بەعس لەچۆمانەوە تا بەندیخانەی ڕایاتیان بۆمباران کرد، لەکاتێکدا پێشهاتی تازە لەڕێگا دایە.

**١٣ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەم بەیانییە دوو فڕۆکە سۆخۆی بەتێزاب دەربەندیان ئاگرباران کرد بەڵام شوکر زیان نەبوو. دوای نیو سەعاتی تر، فڕۆکەکان هەمان شتیان دوبارە کردەوە.

ئێمە تەماشای فڕۆکەکانمان دەکرد کەهەواڵ هات شەڕ ڕاوەستاوە. ئەم هەواڵە بەتەواوی بڵاو بۆتەوە. سەعات ١١,٣٠ی بەیانی دوا هەواڵ هات کە لەسەعات ١١ شەڕ بەتەواوی ڕادەوەستێ‌و بروسکە بەهەموو بەرەکان دراوە بەڵام سەیر ئەوەیە سەعات ١١,٣٠ دوو باجەرو دوو سۆخۆی لەئاسمانی ناوچەکە پەیدا بون‌و بۆمبارانی ناوچەی کەلیتەو خانەقاو ئەو ناوەیان کرد.

لێرەدا دەبێ بزانین ئەم شەڕ ڕاگرتنە چۆن شەڕ ڕاگرتنێکە؟ ئایا کام لا

خۆی بەسەر ئەوی تردا دەسەپێنێ؟ ئەگەر سەیری وتووێژەکانی ساڵانی رابردوو بکەین، هەموو جارێك حکومەتەکان بەدزییەوە پەیوەندییان بەشۆڕشەوە دەکردو داوای شەڕ راگرتنیان دەکرد، ئینجا سەرکردایەتیی شۆڕش قبوڵی دەکردو شەڕ دەوەستاو گفتوگۆ دەستی پێ دەکردو کورد مەرجەکانی خۆی دەسەپاند.

بەڵام ئەمجارە بەپێچەوانەوەیە، ئێمە شەڕ رادەگرین‌و بەسەریشماندا سەپێنراوە کەشەڕ راگرین. ئەمجارە حکومەتی بەعس مەرج بەسەر شۆڕشدا دەسەپێنێ. ئەی هاوار مەرجی بەعس چەند کوشندەیە بۆ میللەتی کورد. من لەو بڕوایە دام بەعس هەوڵ دەدات سەرکردایەتیی شۆڕش سەر بۆ بەعس‌و کوردە خۆفرۆش‌و زۆڵەکان دانەوێنێ. ئەمەش بۆ مرۆڤی بەشەرەف مردنێکی بەئازارە.

دوا هەواڵ هات کەگوایە شەوی رابردوو جەنابی بارزانی گەڕاوەتەوەو فەرمانی داوە کەپێشمەرگە لەلایەن خۆیەوە شەڕ راگرێ‌و ئەگەر سوپا ویستی بێتە پێش لێی بدرێ. بەڵام من وا تێدەگەم حکومەت وا بەئاسانی شەڕ راناگرێ‌و هەوڵ دەدات زیاتر بێتە پێش یان داوای ملکەچ کردن لەسەرکردایەتی بکات.

بەکورتی، رۆژێکی تاریك‌و رەشە لەمێژوی کورد، هەرچەند خەڵکیش وەڕس بووە لەشەڕو حەز لەئاشتی دەکات.

١٤ی ئازاری ١٩٧٥

ئەمڕۆ سەعات ٨ی بەیانی بەشی عەرەبیی ئێزگەی لەندەنم کردەوە، گوتی: حکومەتی عیراق لەسەر بڕیارو گفتوگۆی دیپلوماسییانەی عیراق‌و ئێران رەزامەندیی لەسەر شەڕ راگرتن بۆ ماوەی دوو هەفتە نیشان داوە. عیراق گوتویەتی لەماوەی ئەو دوو هەفتەیە، هەر کوردێکی یاخی بیەوێ بچێ بۆ ئێران با بچێ‌و ئەوانی تر دەبێ خۆیان بدەن بەدەستەوە.

هەروەها لەندەن گوتی: ئێرانیش لەماوەی ئەم دوو هەفتەیە سنوری خۆی لەگەڵ عیراق داناخاو ئەو کوردەی ئاودیو بێت قەدەغەی ناکا بەڵام دوای ئەو ماوەیە سنور دادەخرێو هاتوچۆ قەدەغە دەکرێ.

لێرەدا وا دەردەکەوێ کەپێکهاتنی ئێرانو عیراق پیلانێکی دژی شۆڕشی کوردەو ئێستا دوارۆژێکی رەش بەرامبەر بەگەلی کوردو بەشداربووانی شۆڕش دێتە بەرچاوم. خودا ئەم میللەتە هەژارە بپارێزێ. دور نیە زۆر لەکاربەدەستانمان کەناوێرن بێننەوە، روو بکەنە ئێران. دیارە ئەمڕۆ فڕۆکە نایەت.

شەوی رابردوو نامەیەك لەلایەن خالید ئاژگەیی‌یەوە بۆ باوکم هات کەئەمە دەقەکەیەتی:

موحتەرەم جەنابی مام حەمەد ئاغا

سلاو ئیحتیرام

کاك فرانسۆ[1] پێی راگەیاندم کە ژنو منداڵەکان تەنها لەگەڵ کاك حەمید مانیع نیە ئاوای ئەودیو بن

ئیتر حورمەت.

براتان خالید ئاژگەیی

**١٥ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەمڕۆ حەمید بڕیاریدا بەبێ رەزامەندیی باوکمو ئێمە بچێ بۆ ئێرانو منداڵەکانی فاخیریش ببات. من بەم بڕیارە ناڕەحەت بومو هەندێ قسەشم بەحەمید گوت کەهەوڵ دەدا جیاوازی لەناو خێزانەکە دروست بکاو پێم

[1] مەبەست فرانسۆ هەریرییە کە لەبارەگای بارزانی کاری دەکرد. لەساڵی ١٩٢٧ لەگوندی هەریر لەپارێزگای هەولێر لەدایك بووە. لەناشۆڕییەکانی کوردستانەو ئەندامی پارتی بووە. ئەندامی یەکەم خولی پەرلەمانی کوردستانە. لە١٨ی شوباتی ٢٠٠١دا لەهەولێر بەدەستی چەکدارەکانی رێکخراوی پشتیواتانی ئیسلام تیرۆر کراوە .

گوت چوونت خراپەو ئێوەش وەك ئێمە ئارام بگرن با بزانین خودا چی دەكات بەڵام سودی نەبوو. ڕۆیشت بۆ سنور. هەندێ كەسی دیت بەڵام وا دیار بوو پێیان گوتبوو پەلە مەكە.

بەهەر حاڵ، هاتەوەو ئێوارەو دیسان چوو بۆ بارەگای بارزانی بەڵام لەوێ كەسی نەدی بوو.

وەزع قۆڕەو خەڵك ورەی بەرداوەو نازانێ چی بكات. بێ ورەیی خەڵك گەیشتۆتە ڕادەیەك زۆر كەس چەكی فڕێ داوەتە ناو (ئارامگای) شێخی باڵەك. لەوەش زیاتر، كلاشنكۆفیان بەپێنج دینار فرۆشتووە.

سەركردایەتیش ورەی نەماوە. فەرمانگەكان بەرەڵان‌و بێ خاوەنن. خانوی فەرمانگەكان پڕ شتە بەڵام بێ خاوەنە. كاربەدەستان بۆ ئێران خەریكی ڕاكردنن.

ئەمڕۆ كۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی عیراق‌و ئێران‌و جەزائیر لەتاران دەستی پێ كرد بۆ باس كردنی ڕێككەوتننامەی جەزائیر كە لەلایەن شاهنشاو سەددام حسێنەوە ئیمزا كراوە. لەو كۆبونەوەیە باسی ناكۆكیی نێوان عیراق‌و ئێران دەكەن. شای ئێران پێشوازیی لەسعدون حومادی‌و[1] عەبدولعەزیز بووتەفلیقە[2] بەحزوری عەباس عەلی خەلعەتبەریی[3] وەزیری

---

[1] سەعدون حومادی لەكاتی واژۆكردنی ڕێككەوتننامەی جەزایردا وەزیری دەرەوەی عیراق بووە. لەساڵی ١٩٢٠ لەكەربەلا لەدایك بووە. ماوەیەك سەرۆكی ئەنجومەنی نیشتمانیی عیراق‌و سەرۆكی وەزیرانی عیراق بووە. پاش هەرەس هێنانی ڕژێمی بەعس لەساڵی ٢٠٠٣، دەستگیر كراو ساڵی دواتر ئازاد كرا چونكە ناوی لەلیستی داواكراوەكان نەبوو. لەساڵی ٢٠٠٧ لەئەڵمانیا كۆچی دوایی كردووە .

[2] عەبدولعەزیز بووتەفلیقە لەكاتی واژۆكردنی ڕێككەوتنامەی جەزایردا وەزیری دەرەوەی جەزایر بووە. لەساڵی ١٩٣٧ لەشاری وەجدە لەمەغریب لەدایك بووەو بەڕێچەڵەك ئەمازیغییە. لەخەباتی ڕزگاریخوازی جەزایر لەدژی فەرەنسا بەشدار بووە. لەساڵی ١٩٩٩دا بۆتە نۆیەم سەرۆكی جەزایر .

[3] عەباس عەلی خەلعەتبەری وەزیری دەرەوەی ئێران بووە، پاش ڕوخانی ڕژێمی شا لەساڵی

دەرەوەی ئێران کردووەو لەسەر خوانی ئەو نانیان خواردووە.

**١٦ی ئازاری ١٩٧٥**

بەردەوام ماڵو خەڵك دەڕۆن بۆ ئێرانو زۆر لەبەر سەرما لەسەر سنور ماونەتەوە. بەڵام خەڵك ئەوەندە تەنگاوە ئاگایان لەسەرما نەماوە.

سەبارەت بە بەرەکان، شەڕ نیە بەڵام حکومەت چیای حەسەن بەگی بەتەواوی گرتوەو وەکو باس دەکەن لەبەر بەفر بەهەلیکۆپتەر گونیەی خۆڵ بۆ ڕەبایەکانی سەر حەسەن بەگ دەگوازنەوە. هەروەها دوژمن هاتۆتە سەر دۆڵ بالیسو ئەو ملەشی گرتووە کەدەکەوێتە نێوان بێشەو دۆڵ بالیس.

سەبارەت بە بەرەی جادە، دوژمن سەری چیای ڕۆڵەی گرتووە کەدەڕوانێتە سەر دەرگەڵەو بەسەر بنگێلانو حافزدا زاڵە. دور نیە هێرش بکاتە سەر بەرەی ناودەشتو دۆڵەڕەقەش.

**١٧ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەمڕۆ کەمێك ڕۆژ خۆش بوو. وەزع هەر ئاڵۆزەو خەڵك بۆ ئێران دەڕوات. شەڕ نیەو خەڵك چاوی بڕیوەتە سەری مانگی نیسان کەماوەی ئاگربڕ تەواو دەبێت. ئایا هێرشی حکومەت چۆن دەبێو شەڕ سەر لەچی دەدات؟ ئومێد کەمەو شەڕ لەئاشتی نزیکترە. شەڕی بەرەییش نامێنێ.

**١٩ی ئازاری ١٩٧٥**

ئەمڕۆ هەندێ دەنگوباسی ناخۆشو تەمومژاویو سەیرو چاوەڕواننەکراو بەر گوێم کەوت کەچەند خاڵێکی گرنگی تێدا بوو کەبۆ میللەتی کورد بەشێوەیەکی گشتی کارەساتو قوڕبەسەریو ماڵوێرانییە.

شەوی ڕابردوو کۆبونەوەی فەرماندەی هێزەکانو ئەندامانی کۆمیتەی

---

١٩٧٩ لەسێدارە دراوە .

ناوەندیو مەکتەبی سیاسیی پارتیو کاربەدەستانی تر کرا، بارزانیش ئامادە بوو. لەو کۆبونەوەیە باسی ئەوە کرا داخوا دەتوانن شەڕ بکەن یان نا بەڵام دوای ئەوەی زۆر زۆر خەریکی تاوانبارکردنی یەکتر بونو لێپرسراوەتییەکەیان دەخستە ئەستۆی یەکترو دوای دەمەقاڵەیەکی زۆر، دوو را هاتە دی. بەڵام بارزانی لەو باوەڕەدا بوو کەشەڕیان پێ ناکرێ، بۆیە گوتویەتی ئێمە شەڕ ناکەینو بەهەموو بەرەکانی پێشمەرگەی گوتووە کەدوو ڕێگایان لەپێشە: بڕۆنەوە ناو حکومەت یان چەك فرێ بدەنو بچنە ئێران، گوایە بروسکەشی بۆ بەرەی بادینان کردووە بۆ ئەسعەد خۆشەویو کاربەدەستەکانی بادینان کەدوای ئەو بڕیارە بێن بۆ ئێرە.

بەکورتی، شۆڕشی ئێمە چش، واتە دەیان ساڵی تر دوا کەوتین. ئەی ئەم هەموو قوربانییانە؟ ئەی ئەم هەموو شەهیدانە؟ ئەی ئەم هەموو خوێنە ئاڵو پاکەی رژا؟ ئەی ئەم هەموو فرمێسکەی جۆگەی بەستووە؟ ئەي ئەم هەموو تەمی هەناسەی دایكو خوشکی جەرگبڕاو؟ ئەی ئەم هەموو ماڵوێرانیو قوڕبەسەریو ئەم هەموو سەرماو گەرمایەی کە پێشمەرگەو میللەت لەماوەی ئەو سێزدە ساڵو نیوەی شۆڕش؟ ئەی ئەم هەموو زەرەرو زیانەی بەر میللەت کەوتو ئەو وێرانییەی بەر دێهاتو شارەکان کەوتو ئەو زەویو زارەی بەبۆمباو ناپاڵم کێڵدراو ئەم هەموو کشتوکاڵو شینایییەی سوتێنرا؟

ئەم هەمووە چی بەسەر هات؟ هەموی بەباو بەئاو چوو. بەڵێ وا دیارە بارانی ئەم بەهارە، بەتایبەتی بۆ ئەوە دەبارێ کەخوێنی پاکی شەهیدان لەسەر روی زەویی کوردستان راماڵێو بسڕێتەوەو گومی بکات.

وا دیارە بەفرو بارانی ئەمساڵ بۆ ئەوە دەبارێ تاکو بەری داهاتوو چاوی بەڕەنگی سوربوی خاکی نیشتمان نەکەوێ نەوەك لێی بسڵەمێتەوەو ئاگرو گڕ هەناوی داگرێ. بەڵێ وا دیارە باران بۆ ئەوە دەبارێ تاکو خوێنی هەردولا، شەهیدو دوژمن، پێشمەرگەو سەرباز، بەلافاو تێکەڵاو بنو

بەیەکەوە لەژێر زەوی جۆگە ببەستن‌و لەبەر چاوی نەوەی تازە گوم بن.

بەڵێ وایە. بەڵام من لەو بڕوایە دام ئەم خوێنە ڕژاوەو ئەو تەرمانەی لەژێر خۆڵ‌و لەسەر خۆڵ پوکاونەتەوە، دەبنە پەین بۆ رواندن‌و بەهێزکردنەوەی داری ئازادیی گەلی کورد.

دەك ماڵت وێران بێ دوژمن. دەك ئەی کوردی کوردخۆر تۆش ماڵت وێران بێت. دەبا ئەو خوێڕییانە بچنەوە کەنەخشەی ئەم شکستەیان کێشاوە. زۆر لەکاربەدەستانی ئێمە تا سەری میللەتی خۆیشیان نەخوارد لەناو نەچوون.

لەدوای کۆبونەوە، وا بڕیار درا بروسکەیەك بۆ حکومەت بەناوی مەکتەبی سیاسیی حزبەوە بنێرن‌و تێیدا داوای لێبوردن بکەن بەلکو بەزەیی بکەوێتە دڵی بەعسی بێدڵ‌و کەرەم- بکات‌و دست بەگفتوگۆ بکاتەوە بەلکو تۆزێ ئاوی رویان بپارێزن.

مەسەلەیەکی کوردی هەیە دەڵێ "ئەگەر زەرەر لەنیوەش بگەڕێتەوە هەر قازانجە" بەڵام کاربەدەستانی ئێمە لەسەر ئەو بنچینەیە بروسکەیان لێداوە کەئەگەر زەرەر لەچارەکی چارەکیش بگەڕێتەوە هەر باشە. با واز بێنن‌و با وامان بەسەر بێت. خۆمان کوشندەی خۆمانین.

ئەگەر خۆمان ئەوەندە بە بەژن‌و باڵای بەعس‌و حکومەتمان هەڵنەگوتباو ئەوەندە خۆمان نەکردبا بەنۆکەری بەردەستیان، ئەوانیش نەیاندەتوانی لەمافی کورد سەرکێش بن‌و ئەو مافە بخەنە پشت گوێ. ئەگەر هەر ئەوەشمان دەکرد، دەبوایە بەو ئەنجامە رازی بوینایە. مادام رازیش نەبوین، دەبوایە کۆڵەکەیەکی قایم‌و توندمان مسۆگەر بکردایە تاکو پشتی بدەینێ. نەدەبوو بەتەمای تەمی سەر چەم بین‌و خۆمانی تێدا حەشار بدەین چونکە هەر کەرۆژ هەڵبێ، تەم‌و مژ دەڕەوێتەوە.

بەڵێ. شۆڕشمان لەناو چوو بەڵام هەستی نەتەوایەتی‌و ئاگری ناو دەرونی کوردایەتی هەرگیز نامرێ‌و ناکوژێتەوە. ئەم گەرم‌و گوڕییەی لەدەرونی

کوردپەروەران دایە، بێ گومان بڵێسە دەسێنێو ئاگری شۆڕش بەرپا دەبێتەوە. بەڵام دەبێ خانوبەرەی تازە لەسەر بناغەی کۆن ئاوا نەکەینەوە چونکە ئەو شوێنەی ئاوی تێ زاوەو بەکەڵك نایەت. دیارە شوێنەکە زەنەگ بووە، بۆیە دیواری شۆڕشەکەمان رۆچوو.

دەبێ شۆڕش لەسەر بناغەی پشت بەستن بەمیللەت دابمەزرێ چونکە هەر شۆڕشێك پشت بەمیللەت نەبەستێ، بۆ میللەت نیەو سەریش ناکەوێ. دەبێ ٦٠٪ تا ٨٠٪ پشت بەو گەلە ببەسترێ کەشۆڕشی بۆ دەکەینو پێ دەکەینو لەو رێژەیەی کە ماوە دەکرێ پشت بەهێزی دەرەوە ببەسترێ. بەڵام بەداخەوە شۆڕشی ئێمە پشتی بەمیللەتی کورد نەبەستبوو، لەڕاستیشدا بۆ میللەت نەبوو. هۆی هەرە گەورەی نەمانی شۆڕشەکەمان ئەوەیە کە ١٠٠٪ پشتی بەدەرەوە بەستبوو، بەڵام ئەو میللەتەشمان کرد بەسوتەمەنی ئاگرێك کە لەدەرەوە باوەشێنێ لێ دەکرا.

کورد نەمردووەو ناشمرێو بەهەر قوربانیدانێك بێت مافی خۆی هەر وەردەگرێ، بەڵام دەبێ حیسابێکی پاكو راست بۆ خوێنی شەهیدان بکرێو خوێنیان بۆ بەرژەوەندیی تایبەت بەفیڕۆ نەدرێ. دەبێ شۆڕش بەمیللەتو بۆ میللەت بکرێ ئەگینا ماندوبونو قوربانیدان هیچ ئەنجامی نابێ.

مەکتەبی سیاسی بروسکەیەکی زۆر لاوازو بێدەسەڵاتی داوە بە بەعس. بروسکەکە بۆنی قۆڕبەسەریی کوردی لێ دێ. وەڵامی بەعسیش توندوتیژو بێ ساتوسەوداو بێ رەحمانە بوو کەبۆنی هێزو خوێنو کوشتنو بڕینی لێ دەهات. بەعس بەهیچ جۆرێك داوای مەکتەبی سیاسیی قبوڵ نەکرد بۆ گفتوگۆو رایگەیاند کەدەبێ بەبێ قەیدو شەرت خۆیان بدەن بەدەستەوەو بەخۆفرۆش ناوی بردون.

ئەمەش دەقی هەردوو بروسکەیە کە لەئێزگەی حکومەت بەعەرەبی خوێندراونەتەوە:

كانت قيادة الجيب العميل قد بعثت بالبرقية التالية نصها:
الى السيد رئيس الجمهورية المهيب احمد حسن البكر المحترم
الى السيد نائب رئيس مجلس قيادة الثورة السيد صدام حسين المحترم
من المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني

ان مآسي السنة الماضية التي ولدتها الحرب بين ابناء البلد الواحد والاضرار البالغة التي نتجت عنها وضرورة حقن المزيد من الدماء والحرص على مصلحة البلاد العليا والوحدة الوطنية تستوجب ان نكون في مستوى المسؤولية لكي نعمل على تجاوز كل السلبيات والاخطاء ونجد حلا نهائيا للمشكلة الكردية بالشكل الذي يخدم قبل كل شيء مصلحة البلد العليا. اننا نعتقد انه يمكن ايجاد حل ثابت ومعقول بيننا بشكل لا يمكن ان يستغله الغير.

نحن على استعداد للدخول في حوار فوري مع الحكومة وحزب البعث العربي الاشتراكي حول هذا الغرض وارسال مندوب من قبلنا الى طرفكم في حالة استعدادكم لذلك. ابنؤنا رجاءا.

ئەمەش دەقی وەڵامی بروسکەکەی مەکتەبی سیاسییە لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکرو سەددام حسێن تکریتییەوە:

من السيد رئيس الجمهورية والسيد نائب رئيس مجلس قيادة الثورة الى ما يسمى بالمكتب السياسي للمتمردين

برقيتكم المرسلة عن طريق قائد الفرقة الثامنة في ١٩/ ٣/١٩٧٥. كنا ولا زلنا حريصين على براءة الضمير من عثرات الطيش والغرور بما لا يرضاه الله والشعب.

وقد بصرناكم بصدق لا حدود له قبل ١١ آذار ١٩٧٤ بصورة المستقبل المظلم الذي ينتظركم والخسائر التى ستلحق بالشعب جراء ركوبكم مركب السير في طريق مضاد للشعب واهدافه، بما في ذلك شعبنا الكردي وامانيه.

اننا نواجه الاعمال الاجرامية اليوم بقلوب عامرة بالايمان بالنصر وبأن

الله والشعب والرأي العام العالمي معنا.

لا مجال لاختبار نواياكم بعد ان فقدنا الثقة بكم بسبب التجارب المرة السابقة. ان المجال الوحيد المفتوح امامكم الذي سيحقن الدماء هو الاستفادة من العفو الصادر عن مجلس قيادة الثورة والذي سينتهي في واحد نيسان ١٩٧٥ وبدون قيد او شرط.

ان الحل الثابت والمعقول لقضية شعبنا الكردي يكمن في قانون الحكم الذاتي الذي اعلن في ١١ آذار ١٩٧٤. ولا مجال للتسلل ثانية الى المواقع الخلفية. اننا مصممون وبلا تردد على تطهير ارض العراق من الخونة والمارقين الذين الحقوا بالوطن والشعب خسائر جسيمة لن ينساها التاريخ.

هەروەها ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆمان لەگەڵ خاڵ محۆ لێپرسراوی پاسەوانەکانی ئێمە لەلای من خوارد. بەر لەوەی چا بخۆینەوە، لەناکاو پێشمەرگە ساڵح کەیەکێکە لەپاسەوانەکانی ئێمە، هاتە ژوورەوەو شێوەی ئاڵۆز بوو. دانیشتو دوای بەخێرهێنان، محۆ پرسی: ها ساڵح، خێرە هاتی؟ ئەویش گوتی بەڵێ خێرە..مستەفا هاتووەو دەڵێ محەمەد تیلۆی سەرلق لەبازگەی ئازادی چاوەڕێمان دەکات بڕۆین.

گوتی فەرمان هاتووە بچینەوە بەبێ ئەوەی کەس بێتە شوێنمان، گوایە سەرلقەکەیان چووەتە لای محەمەد عەزیزو داوای ئیجازەی کردووە، ئەویش پێی گوتوە: "ئێوەش بڕۆنەوە ماڵی خۆتان، هەموو شتێك کۆتایی هات".

بەکورتی، بەپەلە چاکەمان خواردەوەو هەڵساین جەماعەت بەڕێ بکەین. من زۆر ئاڵۆزو ناڕەحەت بووم چونکە ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کەشۆڕشمان نەماوەو قوڕمان بەسەر کراوە.

تا نزیك بەندیخانەی خەلان لەگەڵیان چوم‌و بەماچ کردن‌و قسەی خۆش‌و داخ هەڵکێشانەوە بەڕێم کردن. واتە ئێمە لەسەعات ١,٣٠ی دوای نیوەڕۆوە ئازادین‌و هیچ پاسەوانمان بەسەرەوە نیە. تەنانەت عیززەددین

قۆجەش[1] لێرە ماوەتەوە. ئەویش دەستبەسەر بوو و ئێستا وەکو ئێمە ئازادە. داوام لێ کرد شتومەکەکانی بۆ ماڵی من بگوێزێتەوەو شەو لای من بخەوێ.

دوای دوو سەعات قاسدێك هاتو عیززەددین قۆجەی ئاگادار کردەوە کەئازادەو گوایە مەسعود بارزانی گوتویەتی بۆ هەر شوێنێك دەیەوێ دەینێرین. ئەویش داوای کردبوو چاوی پێ بکەوێ. بەیانی دەچێتە حاجی ئۆمەران بۆ دیتنی. مومکینە لەرێی ئێرانەوە بچێ بۆ تورکیا. وای بڕیار داوە.

[1] عیززەددین قۆجە کەسایەتییەکی ناسراوی تورکمانی کەرکوکە. لەسەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا پەیوەندیی بەشۆڕشی کوردەوە کرد. لەپڕ دەزگای پاراستن دەستگیری کردو لەبەندیخانەی رایات بەندی کرد. تائێستا نەزانراوە تۆمەتەکەی چیەو بۆچی گیراوە. لەساڵی ١٩٧٥دا پاش نسکۆی شۆڕش عیززەددین قۆجە ئازادکرا. ئەویش چوو بۆ ئێرانو لەوێوە چوو بۆ تورکیا. پاشان چوو بۆ سوریاو لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عیراقدا کەوتە خەبات لەدژی رژێمی بەعس. لەساڵی ١٩٨٠ رێکخراوی نیشتمانپەروەرە دیموکراتەکانی تورکمان لەدیمەشق دامەزراو قۆجە بەسەرۆکی ئەو رێکخراوە هەڵبژێردرا. لەساڵی ١٩٩٤ کۆچی دوایی کردووە.



حسێن محەمەد ئاغای مێرگەسۆری ساڵی ١٩٦٢ لەکاتی
بەرگری لە بارزان شەهید بووە



سەعید محەمەد ئاغا مێرگەسۆری لە بەندیخانەی
ڕایات لە ساڵی ١٩٧٥ شەهید کراوە



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: جەوهەر محەمەد ئاغا مێرگەسۆری و
سەعید جادر شێروانی (ساڵی ١٩٦٧) لەسەردەمی پێشمەرگایەتیدا



ئەسعەد محەمەد ئاغا مێرگەسۆری ساڵی ١٩٧٥ پێش چوونی بنەماڵە بارزانی بۆ ئێران بە چەند ڕۆژێك، لە بەندیخانەی ڕایات شەهید کرا.



جەوهەرو سەعید محەمەد ئاغا مێرگەسۆری و حەمید ئامێدی لەبەردەم هەلیکۆپتەرێك کە شاندی وتووێژکاری هێنا بوو بۆ بارەگای سەرکردایەتی.



نزار محەمەد ئاغا مێرگەسۆری لە بەغدا شەهید کرا



عەتا تاڵەبانیو محەمەد ئاغا مێرگەسۆریو فاخر مێرگەسۆریو ژمارەیەك پێشمەرگە لە كارگەی چیمەنتۆی سەرچنار لە سلێمانی (ساڵی ١٩٦٤)



ڕەشید محەمەد ئاغا مێرگەسۆری لە ساڵی ١٩٧٥ لە بەندیخانەی ڕایات شەهید كراوە



مەجید محەمەد ئاغا مێرگەسۆری لە ساڵی
١٩٧٥ لە بەندیخانەی ڕایات شەهید کراوە



خەلیل سوڵتان مێرگەسۆری لە ساڵی ١٩٧٥ لە
بەندیخانەی ڕایات شەهید کراوە



خەلیل برادۆستی خزمی محەمەد ئاغا مێرگەسۆری نیە بەڵام لەگەڵ
بنەماڵەکەدا گیراو لەگەڵ ئەوانیش لە بەندیخانەی رایات گوللەباران کرا



جەمیل محەمەد ئاغا مێرگەسۆری دەزگای پاراستنی پارتی لەساڵی
١٩٧٤ لە هەولێر تیرۆری کرد

له ساڵانی 1974- 1975دەیان کەس لە بەندیخانەکانی شۆڕش لە رایاتو خەلانو شوێنەکانی دیکە، لەبەر هۆی جیاواز، گیرا بوون. هەر کە سەرکردایەتیی شۆڕش پاش راگەیاندنی رێککەوتننامەی جەزایر لەنێوان عیراقو ئێران، بڕیاریدا واز لە بەرگری بێنێو بچێ بۆ ئێران، بڕیار درا بەشێکی زۆری گیراوەکان گوللەباران بکرێن، لەوانە بنەماڵەی محەمەد ئاغا مێرگەسۆری.

تا ئێستا نەزانراوە کێ بڕیاری جینۆسایدکردنی بنەماڵەی مێرگەسۆری داوە. بەپێی زانیارییەکان، دوو کەس بەناوی عەبدولموهەیمن بارزانیو ئازاد بەرواری لە بارەگای بارزانییەوە چوون بۆ بەندیخانەی رایات لە حاجی ئۆمەران، لیستێکیان پێ بووە، ناوی گیراوەکانی بنەماڵەی مێرگەسۆری تێدا بووە، ناوەکانیان یەك لەدوای یەك خوێندۆتەوەو مژدەیان داونەتێ کە ئازاد دەکرێن چونکە شۆڕش تێکچووەو سەرکردایەتی دەبێتە پەنابەر لە ئێران. پاش ئەوە براونەتە دەرێو پاشان تەرمەکانیان لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ بە کەلەپچەکراوی دۆزراونەتەوە.

ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستی خوێنەر دایە، بیرەوەریی یەکێ لە دەستگیرکراوەکانی بنەماڵەی مێرگەسۆرییە کە لە بەندیخانەی خەلانو پاشان لە بەندیخانەی رایات گیرا بوو و پاشان لەگەڵ باوكو براکانی گوللەباران کراوە.

بلاوکراوەکانی

ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی

EDK